چیرۆک

# عەزیز نەسین




وەرگێڕانی:

**عەبدولستار جەباری**

ناوی کتێب: ئەو هەتیوەی نابێت بە پیاو
بابەت: چیرۆکی وەرگێڕدراو
ناوی نووسەر: عەزیز نەسین
ناوی وەرگێڕ: عەبدولستار جەباری
دەرهێنانی هونەری: ئاکار جەلیل کاکەوەیس
پیتچنین: ئومێد بەگی جاف ئاوڕەحمان بەگ
لە بڵاوکراوەکانی یەکێتیی نووسەرانی کورد– لقی کەرکووك ژمارە (١٥٠)
چاپخانە: کارۆ
چاپی یەکەم– ٢٠١١
تیراژ: (٥٠٠) دانە

# ناوەرۆک

به مامۆستا (عەبدوڵڵای حەسەن زادە)، کە
(عەزیز نەسین)ی بەمن ناساند
**پێشکەشە**

# سوپاس وپێزانین

**خوێنەری هێژا**

ئەم کۆمەڵە چیرۆکەی نووسەری تورکی بەناوبانگ (عەزیز نەسین) کە لەبەردەستتدایە بەرێکەوت وەرم نەگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، بەڵکو ئەوانەم هەڵبژاردوون کە لەگەڵ واقیعی ئەمڕۆماندا گونجاوەو کە دەیانخوێننەوە دەڵێی نەسین لە نێوماندایەو هەر ئەوڕۆ نووسیویانێتی، راستە من لە عەرەبییەوە وەرم گێڕاوون، وەلێ بەهۆی بەڕێز وەستا (محەمەد شرناخی)، کە خەڵکی شاری شرناخی باکووری کوردستانە ولە شاری کەرکووك کاردەکات وکەسێکی زۆر رۆشنبیرە، هەموو چیرۆکەکانی لەگەڵ دەقە تورکییەکاندا بەراوورد کرد، چونکی ئەوانەی وەریان گێرابووە سەر زمانی عەرەبی، دەیان هەڵەی تیادا کردبوو وەکو (بەهەڵە تێگەیشتن و پەڕاندنی وشەو دێڕو بگرە لەهەندێ چیرۆك پەرەگرافیشی پەڕاندووە). وەستا محەمەد هەمووی راست کردنەوە، بۆیە بەتەنها سوپاس بەس نییە، بەڵکو خۆم بەمنەتبارو قەرزداری ماندووبونی دەزانم وسوپاسی ماندووبونی بەڕێزان (شێخ لوقمان حوسێن) و (شنۆ ئیسماعیل) دەکەم، کە بەووردی پیاچوونەوەو چەندین هەڵەی زمانەوانی وتایپیان بۆم راست کردەوە. وهیچ کارێکیش بێ کەم وکوڕی نابێت، گەر هەر هەڵەو کەم کوڕیەکم هەبوو، داوا لە خوێنەرانی ئازیز دەکەم بەگەورەیی خۆیان بمانبەخشن..

**وەرگێڕ**

# عەزیز نەسین کێیە؟!

عەزیز نەسین شان بەشانی نازم حیکمەت و یەشار کەمال و ئۆرهان پاموك یەکێکە لە لوتکەکانی ئەدەبی تورکی بەتایبەتی لەبواری تەنز وکۆمیدیای ڕەش نووسیندا هەرچەندە بەهۆی نووسینەکانییەوە زۆر توشی کێشەو چەرمە سەری بووە. خاوەنی زۆرترین بەرهەمە لە ئەدەبی تورکیدا، لە نووسینی هەمەجۆری وەك کاڵتەجاڕی و ڕۆمان وچیرۆك و شانۆنامە و شیعر - دا بەرهەمێکی زۆری هەیە، بەپێی پێڕستی ناوەندی وەرگێڕانی " یۆنیسکۆ " عەزیز نەسین یەکێکە لە چوارکەسی ڕیزی یەکەمی ئەوانەی بەرهەمیان وەرگێڕراوەتە سەر زۆربەی زمانە جیهانییەکان.

لە گۆڕەپانی ڕۆشنبیریی کوردیشدا خاوەن پێگەیەکی تایبەتەو وزۆربەی هەرە زۆری بەرهەمەکانی وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی. کە جگە لە خزمەتی زۆری ئەدەب و ڕۆشنبیریی تورك و جیهانی، خزمەتی زۆریشی

پێشکەش بە ژیانی کۆمەڵایەتیی دەوروبەرەکەی خۆشی کردووە، وەك ئەو چەندین تەلارەی ناوی " وەقفی عەزیز نەسین " ی لێ ناوە و کردوویەتییە جێی حەوانەوەی هەتیو و بێکەس و بێنەوایان و تا پێگەیشتنی ئەوانە لەو شـــوێنەدا چاودێری بکرێن. نەسین لە بارەی خۆیەوە دەڵێ: ( لە قارس سەرباز بووم، سەرەتا شیعرو چیرۆکم دەنووسی، لەبەر ئەوەی پێیان باش نەبوو، سەرباز بنووسێ ئیدی لەو کاتەوە ناوی خوازراوی (عەزیز نەسین) م لە نووسین وبڵاو کراوەکانم بەکار هێنا، کورتە چیرۆکەکانم لە گۆڤاری (نەتەوە)ی راستڕەو، بڵاو دەکردەوە کە لە ئەنکەرە دەردەچوو، شیعرەکانیشم لە ساڵی ١٩٣٧وە بەناوی (وەدیعە نەسین) لە گۆڤاری (حەوت رۆژەکە) وبەهۆی بەندکردنمەوە لە ساڵی ١٩٤٤لە ریزەکانی سوپا دەرکرام وچوم بۆ ئەســـتەنبوڵ ولە گۆڤاری ( Yedigün ) دەست بەکار بووم .ئەمەش سەرەتای دەست بەکاربونم بوو...

عەزیز نەسین ناوی ڕاستەقینەی (محەمەد نوسرەت ) ە، ( لە ٢٠ ی کانوونی دووەمی ١٩١٥ لە (هەیبەلی )ی ئەستەمبووڵ هاتووەتە جیهان.. نەســـین ساڵی ١٩٢٤لە ئەستەمبووڵ دەســـتی بە خوێندنی سەرەتایی کردووە. ساڵی ١٩٣٧ قوتابخانەی جەنگیی لە " ئەنکەرە " تەواو کردووە و بووەتە ئەفســـەری پلە یەك. ســـاڵی ١٩٣٩ دا قوتابخانەی هونەری سەربازیی تەواو کردووە. لەلایەکی کەوە لە بەشی ئارایشتی ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانـــدا دەوامی کردووە.لەناوچـــە جیاجیاکانی ئەنادۆڵ و تراقیادا خزمەتی لە لەشکری تورکیادا کردووە. دوای خزمەتێکی زۆر بە تاوانی خراپ بەکارهێنانی پلە و پایە لە لەشکر دوورخراوەتەوە. دوای ئەوە ماوەیەك کاری وەك بەقاڵی و ژمێریاریی کردووە. ساڵی ١٩٤٥ دەستی بە ڕۆژنامەنووسی کردووە، هەر لەو ساڵانەدا نووسینی شانۆنامەی کردووەتە

پیشە. دەستیشـــی بە گۆشەنووسیی ڕۆژنامەوانی کردووە. لە زۆربەی گۆڤـــارو رۆژنامەکانی تورکیا بابەتی بڵاو کردۆتەوە لەوانە ( ئەرخەوان وگزنگ....) دواتر گۆڤاری (شەممە)ی دەرکرد، کە لە هەشت مانگ زیاتر نەیتوانی بەردەوام بێ لەدەرچوون. تا ساڵی ١٩٤٦ کە لەم ساڵەدا یەکەمین نامیلکەی خۆی ١٦ لاپەڕەیی بە ناوی " حیزب دامەزراندن و لە حیزب دان " بڵاوکردووەتەوە.

لە ساڵی ١٩٤٦ لەگەڵ " سەباحەددین عەلی " دا گۆڤاری گاڵتەجاڕیی " مارکۆ پاشا "یان دەرکردووە، کە تیراژی فرۆشتنی رۆژانەی گەیشتە (٦٠٠٠٠) دانە.

خۆیان لە سیاسەت و شتی دیکە داوە و تووشی کۆمەڵێك کێشە و ئینجا داخســـتنی گۆڤارەکە بوون. بەهۆی گوتار و نووسینەکانییەوە تووشی گیران و بەندیخانە هاتووە.

ساڵی ١٩٤٦بەهۆی ئەو بابەتانەی لە رۆژنامەی ناوبراو بڵاوی کردەوە بەند کراوە. ســـاڵی ١٩٤٧ لەبەردەم دادگای سەربازیی عورفی (١٠) مانـــگ حوکم درا، پاش تەواوکردنـــی ماوەکەی خۆی، بەهۆی رەخنە گرتنی لە (هنری ترۆمان)ی ســـەرۆکی ئەو کاتەی ئەمەریکا، (٣) مانگ دوورخرایەوە بۆ شاری (بوورسە) وهەر بەو هۆیەوەش رۆژنامەکە داخرا، ودواتر رۆژنامەیەکی تری دەرکرد بەناوی (مەعلوم پاشا) بەمجۆرە عەزیز نەسین لە پاش هەر بەند کردنێك ناوی گۆڤارەکەی دەگۆڕی وەك (مەرحوم پاشـــا و عەلی بابا و پاشای خۆمان و مارکۆ پاشای ئازاد و لەکۆتاییدا "مەدەد"). ساڵی ١٩٥٠بە هۆی وەرگێڕانی چەند بەشێکی کتێبـــی مارکس بۆماوەی (١٦) مانگ حوکم درا. ســـاڵی ١٩٥١ کە لەبەندیخانە دەرچو هیچ کارێکی دەسنەکەوت لە بواری رۆژنامەگەری،

دوکانێکی کتێب فرۆشی دانا، بەڵام سەرکەوتو نەبوو تیایدا.لە ساڵانی ( ١٩٥٢ -١٩٥٤ ) کاری وێنەگری دەکات. ساڵی ١٩٥٥دیسانەوە بۆ چەند مانگێك بەند کرا بێ ئەوەی هۆکارەکەی بزانێ. ساڵی ١٩٥٦ خەڵاتی گەڵای زێڕینی لە ئیتالیا پێ بەخشرا. ساڵی ١٩٥٧ بۆ جاری دووەم خەڵاتی گەڵای زێڕینی لە ئیتالیا پێ بەخشرایەوە. ساڵی ١٩٥٦ بەهاوبەشی لێل نووسەری تورك کەمال تاهیر خانەیەکی وەشاندنیان دامەزراند بەناوی (خانەی هزر) وەلێ ساڵی ١٩٦٣بە هەزاران کتێبەوە سوتا. ساڵی ١٩٦٦ خەڵاتی سمۆرەی زێڕینی پێ دەبەخشرێت لە وڵاتی بولغاریا. . لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٦ لەکۆنگرەی یەکێتیی ئەدیبانی ئاسیاو ئەفریکا لە قاهیرەی پایتەختی وڵاتی میسر بەشداری دەکات.

لە رێکەوتی ١٩٦٧/٤/١٦بە جێگری سەرۆکی یەکێتی نووسەرانی تورك هەڵبژێردرا و دواتر بوو بەسەرۆکی سەندیکای نووسەرانی تورك لەپاش دامەزراندنی ئەو رێکخراوە. ساڵی ١٩٦٧خەڵاتی تیمساحی یەکەمی لە یەکێتی سۆڤیەت پێ بەخشرا. ساڵی ١٩٦٩ خەڵاتی کۆڕی زمانی تورکی پێ بەخشرا.

ساڵی ١٩٧٥خەڵاتی لۆتسی یەکەمی لەلایەن یەکێتیی نووسەرانی ئاسیاو ئەفریکای پێ بەخشرا.

لە بوارە جۆر بە جۆرەکاندا نووسیندا کاری کردووە: لە نێوان ساڵانی ١٩٤٦ و ١٩٧٩ دا چل کۆمەڵە کورتەچیرۆك و دە رۆمان و پێنج یادداشت و پێنج داستان و دوانزە شانۆنامە و حەوت کۆمەڵە شیعر و گەلێکی دیکەی بڵاو کردووەتەوە و چەندین پاداشتی ناوخۆیی و نێونەتەوەیی پێ بەخشراوە. لە بارەی کوردەوە کێبێکی هەیە بەناوی

(کوردانی تورکیاو تورکانی بولگاریا) لەلایەن سیروان رەحیم وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی...
.مخابن لە ٦ ی تەمووزی ١٩٩٥ لە ناوچەی ئیزمیر کۆچی دواییی کردووە.

**سەرچاوە:**
**١ ـ ئەنتەرنێت**
**٢ ـ ئەحمەد تاقانە. گۆڤاری گزنگ ژمارە ٩٠ ئایاری ٢٠١١**

# ئەوهەتیوەی نابێت بە پیاو!!

زۆرم گلەیـــی لە خاڵۆم هەیە، پاش ئەوەی قۆناغی ئامادەییم بەســەر کەوتویی تەواو کرد، کەچی وتبووی:

ـ ئەم هەتیوە دوواڕۆژێکی ڕوونی نابێت.

گویێ لەقســەی خاڵۆم دەگیرێت وهەزار و یەك حیســـابی بۆ دەکەن، چونکی تاکە کەسە لە بنەماڵەکەمان بووەتە خاوەن پلەوپایە.

منیش پێم گوتن:

*دەخوێنــم و دەیســەلمێنم بۆخاڵــۆم، کە چۆن بەهەڵــەدا چووە، لەو هەڵوێستەی، لەهەمبەر من هەیەتی و بۆی ڕوون دەکەمەوە من کێم؟

ئەم قســانەی منیان گەیاندە خاڵۆم، کە چۆن دامێنگیری خوێندنەکەم دەبم، کەچی هەر پێیانی گووتبوو:

ــ ئەم کوڕە نابێت بە پیاو.

لەترســی ئەوەی نەبادا دەســتم لە کارێك گیر نەبێت، لە پاش کۆلێژی ئاداب، فەلسەفەشم تەواو کرد.

هەینێ خاڵــۆم بەمەی زانی، لەداخانە گڕی گــرت وپڕ بەگەرووی

هاواری کرد:
ــ پێتانم نەگوت خێر بەنێوچەوانی ئەم هەتیوەوە نییە؟ لەبەر ئەوەی نابێت بەپیاو.
لە راستیشدا کاتێ کۆلێژی فەلسەفەم تەواو کرد وهاتمەوە سەرەخۆم بینیم خاڵۆم لەسەر هەقە، چونکێکم ئاداب وفەلسەفە کارێکت بۆدابین ناکەن وتاکو پشتیان پێ قایم بکەیت، هەر بۆیە هیچ پیشەیەکم نەدۆزیەوە، تیکە نانێکی لێ بخۆم!
لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا کۆلێژی پزیشـــکی وئەندازە گەلێك ســـوود بەخشن، تەنانەت مەرجی شو کردنی کیژانیش ئەوەیە زاوا دەبێ یا دکتۆر بێت یانیش ئەندازیار.
قەناعەتم بە ئەندازیاری نەبوو، کاتێ سەرپەرشتیاری تەلارێك دەکەیت، وەستاکە لەجیاتی چیمەنتۆ قوڕ بەکاردێنێت، هەینێ کەرەستەی بیناش دەسنەکەوێت، لەجیاتی شیش تەنەکە بەکاردێنێت، کاتێکیش خاوەن تەلار توشـــی قەیرانی دارایی دەبێت ناچـــاری دەکات لەجیاتی بزماری تیژ بزماری ئاســـایی بەکاربێنێت، گەر تەلارەکە بڕووخێت بەرپرســـیارێتی دەخەنە ئەســـتۆی ئەندازیارەکە، گوایە لە جێ بەجێ کردنی پرۆژەکەدا بەهەڵەداچووە.
وەلێ دکتۆرەکان جودان گەر هەڵەیەك بکەن لەنووسینی دەرمان و بەوهۆیەوە نەخۆشێك لەبن دەســـتیان بمرێت، یەکسەر هۆکارەکەی دەگەڕێننەوە بۆ نەخۆشـــیەکی وەهمی وبەزمانی لاتینی ویۆنانی وبـــەدوور و درێژی دەینووســـن وســـوك وباریك خۆیان دەرباز دەکەن. بۆیە چوومە کۆلێژی پزیشکیەوە، لەگەڵ ئەوەشدا خاڵۆم زۆر توڕە بوو:
ـ ئەرێ پێتانم نەگووت قەت نابێت بەپیاو؟ باشـــە من بۆ نەچم بۆلای؟

بەراستی سەردانیم کرد لەماڵی خۆیان پێیم گوت:
* خاڵەگیان، قۆناغی ســـەرەتاییم بە پلەی زۆر باش بڕی، هەینیٚ لە قۆناغی ئامادەییم بەســـەرکەوتوویی دەرچووم، ناومیان لەسەر تابلۆی شـــەرەف تۆمارکرد، دواتر بڕوانامەی دیپلۆمم لە ئاداب وەدەســـت هێنا بەهەمان شێوە لەفەلسەفەش،
ئێستاش قوتابیم لە کۆلێژی پزیشکی، لەمەزیاتر چت لە من دەویٚ؟
هەرچیەك دەکەم تۆ هەر بەو رستەیەوە پابەندی وبەردەوام بەهۆو بەبیٚ هۆ هەر دەڵێی: نابیت بە پیاو؟!
پرسیاری لێم کرد:
باشە، ئایە بووی بەپیاو؟
* تاکو نهۆ نا، بەڵام بەئیزنی خوا دەبم.
ـ تا خاوەن ئەم ســـەرو ئەقـــڵ و بیرکردنەوەیە بیت، قەت نابیت بە پیاو، تەنانەت بڕوانامەی زانکۆکانی (ئەزهەر) و (سۆربۆن) و (کامبردج)یش بەدەست بهێنی، نەك دووان، گەر سیٚ کۆلێژیش تەواو بکەی.
* بۆچی خاڵە گیان...سەرم عەیبی چییە؟
ـ بژنەفە و گوێیەکانت باش بکەوە، دەزانی من چەنیٚ پارەم هەیە؟
هەموو کەسیٚ دەزانیٚ خاڵم چەنیٚ دەوڵەمەندە، بۆیە بێدەنگ بووم، کەچی خۆی کەوتە ژماردنی ئەوەی هەیەتی:
ـ باڵەخانەیەکی شەش نهۆمیم هەیە، لەهەر نهۆمێك دوو شوقەی تیایە، تەلارێکـــم لە (لاهیلۆ)هەیە، و دانەیەکی تریش لە (ماچکا) وبەهەمان شێوە لە(ئەنقەرە)، ونووسینگەیەك لە(تەهتە قەلا) وبێستانێك لە(ئاسکی شەهر)، وڤێلایەك لە (ئارنکۆیی) وکۆگایەك وپێنج دووکان.....
واقم وڕما لەوەی گوێم لێبوو.

- جگە لەو هەمووە،ئەدی ئەو پارانەی لەبانك دامناون، باشە من دەرچووی کام قوتابخانەم، ها؟
* بێگومان ئەوروپا...
پێکەنی ودواتر وتی:
- خاوەنی هیچ بڕوانامەیەك نیم..
* کەواتە دواناوەندیت تەواو کردووە...
- دابەزە، دابەزە خوارتر..
* ئامادەیی ...
- تەنانەت سەرەتایشم تەواو نەکردووە..
پتر سەرم سوڕما و قسەشم بۆ نەدەهات، بەڕادەیەك نەمتوانی یەك وشەش دەربڕم...
- دەزانی چ کارێك دەکەم؟.
* نا، ئەمەشیان نازانم.
بێگومان بازرگان نییە، نە بەڵێندەریشـــە ولەبەر ئەوەی جۆری کارەکەی نازانم چییە پێیم گوت:
* هەبێ ونەبێت تۆ سیاسەتمەداری.
بزەیەکی هاتێ و گوتی:
- من هیچ پیشەیەکم نییە، و میراتیشم بۆ بەجێ نەماوە تاکو بەدرێژی وبەپانی شەپلی شەپانی پێبکەم و بیخۆم، بیتاقەی یانسیبیشم بۆ دەرنەچووە، وژنەکەشم دەوڵەمەند نییە، سوپاس بۆخودا کاری بەدڕەوشتیش ناکەم.
* ئەدی چۆن دەوڵەمەند بووی؟
- ها، ئیســـتا خەریکە تێبگەیت، باش گوێم لێبگرە، بابم براکەمی ناردە (ئەستەنبول) بۆ خوێندن، بەستەزمانە..تاکو ئێستاش هەر ساتمە دەکات

لەژیاندا، لێ خوشکەکەم شوی بە فەرمانبەرێك کرد لەگوندەکەمان کاری دەکرد، مەبەستم باوکی تۆیە، پاشان ئەوانیش لە ئەستەنبوڵ نیشتەجێبون وباری گوزەرانیان مام ناوەندی بوو، لەکاتی خزمەتی سەربازیمدا فێری خوێندنەوەو نووســـین بووم، بەهۆی چاوکراوەییمەوە پلەکەم بۆ (عەریف) ی بەرزکرایەوە، کە لەخزمەتی سەربازی لێبوومەوە، دەستێ سیپاڵی نوێم کڕی، هەرچەندە دە لیرەشم شك نەدەبرد، وەلێ وەکو کوڕانی شار لەبەرم کرد، هەینێ لەوێســـتگەی شەمەندەفەری (حەیدەرپاشا) هاتمە خوارێ حەشاماتێکم بینی، کە بۆ پێشوازی هاتبوون منیش خۆم خزاندە نێویـــان وتاکو نهۆش هەر لەناویاندام، هەر لـــەو ڕۆژەدا وکاتێ لەپێشەوەی خەڵکەکەدا دەڕۆیشـــتم ڕۆژنامەنووسان پەیتا پەیتا وێنەیان دەگرتـــم، لە هوتێلەکەیـــش خانەیەکی تایبەتیان بـــۆم تەرخان کردبوو، میوانداریانم کرد، خواردم و خواردمەوە، ئەو کات نەمدەتوانی بە باشـــی قسان بکەم، چونکی لاوێکی بێ بەهرەو بێ ئەزموون بووم، ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەش بووبێ سەرسام بوون بەمن.

* ئەدی خاڵەگیان، لێیان نەپرسیت ئەتو کێی، چدەکەی لێرە؟

ـ هەتیوی گەلحۆ، هەموویان وەك من وابوون، کەس بەکەســـەوە نەبوو، کێ پرســـیارم لێ بکات؟.....بۆ ڕۆژی دوایـــی وێنەکانمان لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکانی داپۆشـــی بوو، ڕەســـمەکەی من لە تەنیشـــت گەورەکەیانـــەوە داندرابوو، بەمجۆرە خوێنـــەران وێنە و ناوەکەی منیان ناسی، ڕۆژنامەنووسەکان کێ بڕکێیان دەکرد بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەتن و وێنەگرتنم، تاکو لەلاپەڕەی یەکەم وبەم ناو ونیشـــانە بڵاوی بکەنەوە (کەسایەتیەکی ناودارو گرنگ لێدوانێکی تایبەتی بۆ ڕۆژنامەکەماندا ) بەمجۆرە ئیدی دوور نەدەکەوتمەوە لە ئاهەنگ و مەراسیمی کردنەوەی

پرۆژە لە (سرکەچی )و شەمەندەفەری (یەشیل کوێی ) و(باڵەخانەکان)...
هەندێکیان وایاندەزانی یەکێکم لـــەوان، هەندێکی تر مەزەندەی ئەوەیان دەکرد یەکێکبم لە بەرهەڵستکارە گرنگەکان،
بێ هیچ تەکلیفێك قسەم لەگەڵ کەسایەتییە بەناوبانگەکانی وڵات دەکرد، رەنگە ئەمە باشـــترین رێگایەك بێت بۆ ســـەرکەوتن، بەبێ ئەوەی خۆم ماندوو بکەم وپارەیان بۆ خەرج بکەم، دەستم دەخستە سەرشانیان وبەقاقای پێکەنینەوە لێلیانە گفتوگۆم دەکـــرد، هەر لەبەر ئەمەش بوو منیان بە یەکێك لە کەســـایەتییە گرنگەکان دەهاتە پێش چاو، هەندێکیان پرسیان بەمن دەکرد، منیش ئامۆژگاری ورێوشـــوێنم نیشاندەدان، زۆرجارانیش کارتەکەی خۆم دەداپێیان ولە پشتەوەی دەمنووسی حەسەنی برام : ئەم کارە بۆ فلانەکەس مەیسەر بکە...چاوانت ماچ دەکەم...بێگومان کەسیان دەسیان بەڕوی منەوە نەدەنا، پاش ماوەیەك ئەوان داوای هاوکاری منیان دەکرد، منیش هەر لەســـەر کارتەکەی خۆیان ئەم رستەیەم دەنووسیەوە، کاکە حەمە گیان، عەلی هاوڕێم پێویستی بەهاوکاری جەنابتانە سوپاسی بەدەنگەوە هاتنتان دەکەم، ئیدی دەمنارد بۆ شوێنی مەبەست...
رۆڵە گیان ئا بەمجۆرە تاکو ئەمڕۆ خۆشـــم نازانـــم چ کارێك دەکەم، هەروەها تۆش، کەسانی تریش دەزانن، من سیاسەتمەدار نیم، نە بازرگان ونە شـــتیترم، کوڕی خۆم دەشـــێ ئەندامانی پەرلەمـــان جارێکی تر هەڵنەبژێردرێنەوە، دەکرێ متمانە لە حکومەت بسەندرێتەوە، وبەڕێوەبەری گشـــتی دەست لەکار بکێشـــێتەوە یاخود تڕۆ بکرێت، دەکرێ حزبەکان دەسەڵات بگرنە دەست، یان لەبەرەی ئۆپۆزسیۆندا بن....
وەلێ من لەهەمەوو کات وزەمانێکدا لەسەر پێی خۆم وێستاوم. شەرەفێکی مەزنە بۆ کوڕان وکچانی کەســـایەتییە گرنگەکان گەر من شـــایەتی

مارەبڕینیانبم، بۆ هەموو بۆنەو ئاهەنگەکانیان بانگهێش دەکرێم، گەر بچم زۆر ڕێزم لێدەگرن، ئێستا تێگەیشتی هەی نەفام؟

* باشە خاڵە گیان، ئەگەر دەرچووم لە تاقیکردنەوە؟

ـ سەرکەوتوو نابیت چونکێکم قوتابخانەو زانکۆ خێرتیان بەخشیوە ومێشکتیان تێکداوە.

* چاکە خاڵە گیان، کەواتە نابم بەپیاو؟.

ـ ئەم کارتە ببە و بیدە بە.........

ئیتر بەهۆی ئەو کارتەی خاڵۆم پێیدام بووم بە پیاو.

# پشکێنەر

هەرکــە بەڕێوەبــەری قوتابخانــە، هەواڵی هاتنی پشــکێنەری بۆ خوێندنگەکەمان پێڕاگەیاندین، لەترسان زەندەقمان چوو وگیانمان کەوتە لەرزین! بەڵێ ئیزرایل دێتە ســەرمان، ئیدی کەوتینە حاڵەتێکەوە کافر پێمان موســڵمان دەبوو، لەشمان وەك بین ئاو دەلەرزی...چونکی تا ئەو رۆژە نەماندەزانی پشکێنەر چییەو روخساری چۆنە، نەشمان دەزانی ئەو کارە سەرســوڕهێنەرو لە ئەقڵ بەدەرە چییە دەیکات؟ چ پرسیار گەلێك دەکات؟ وەلێ مامۆستاکەمان بەچاوی خۆی چەند جارێك بینی بووی! تەماشایەکی مامۆستاکەمان کرد بینیمان وەکو ئێمە شپرزەیە و ترسی لێ نیشتووە، بەقورسی وبەتۆبزی قسان دەکات، دەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی دەدا ئەو ترس ودڵەڕاوکێیەی بشارێتەوە لێمان، پێمانی گوت:

ـ قوتابیانی خۆشەویست، مەترسن چونکی من دەزانم پشکێنەر چدەکات، هەندێ پرسیاری دیاری کراوتان لێدەکات لەبارەی زانیاریە گشتییەکان وداوای خوێندنــەوەی پارچە هۆنراوەیەك و وڵام دانەوەی پرســیارێکی بیرکاری، ئا بەمجۆرە..

ئێســـتاش هەریەك لەئێوە قەڵەم وكاغەز ئامادەبكات، هەندێ پرسیارتان لێدەکەم وئێوەش وڵامەکانیان بنووسنەوە، کەنگێ پشکێنەریش بێت هەر ئەم پرســـیارانەتان ئاڕاستە دەکات، ئێوەش دەبێ لە ئامادەباشیدا بن تاکو بەوردی بەرسڤی بدەنەوە.
هەر یەکێك لە ئێمە قەڵەم و کاغەزی ئامادەکردو مامۆستاش دەستی کرد بە نووسینی پرسیاری یەکەم:
- لە چ ساڵێکدا ئەمەریکا دۆزرایەوە؟
هەموومان وەڵاممانداوە: ساڵی ١٤٩٢ز
- زۆر راستە..
پرسیاری دووەم: ئەو کەسە کێیە لە هەموو کەسێ زیاتر خۆشمان دەوێت؟
هەرکەسەو بەجۆرێك وەڵامیداوە، هەندێکیان وتیان:
"نیشتمان" یەکێکی تر "دایکم" منیش گوتم "باوکم"
- خـــودا بەرخوردارتان بـــکات رۆڵەکانم...هەموو وڵامەکانتان راســـتن ولەدەفتەرەکانتان بیانووسنەوە...
پرسیاری سێیەم: کێ شاری ئەستەنبوڵی رزگار کرد؟
هەموو: سوڵتان محەمەد فاتیح....
- زۆر باشە وەڵامەکەتان بنووسنەوە.
پرسیاری چوارەم: کێ مزگەوتی سولەیمانیەی دروست کرد؟
وەڵام: تەلارساز "سینان" دروستی کرد.
- ئەمەش هەر راستە...
هەموو وەڵامەکان بەباشی بخوێننەوە و سەرلەبەریان ئەزبەرکەن...
دواتر مامۆســـتاکەمان مانای پارچە هۆنراوەیەکی شـــیکردەوە، لەسەر تەختە رەشـــەکەش پرســـیارێکی بیرکاری بۆمان نووسییەوە...ئێمەش

نووسیمانەوە...مامۆستا وتی:
ـ زۆرباشە...ئەم وڵامانە بەتەواوەتی ئەزبەرکەن وچەند جارێك پیابچنەوە...
هەر وەك چۆن سـیرەواڵە* بەناو ژوورەکەدا دەفڕن ودێن ودەچن ئێمەش بەهەمان شێوە کەوتینە فسکە فسك:
ساڵی ١٤٩٢...باوکم...سوڵتان محەمەد فاتیح..سینانی تەلارساز...و....
لەم کاتەدا بینیمان پشـکێنەر پۆل بە پۆل دەگەڕێ،پێش نیوەڕۆ بەفیزو لەخۆبایی بوونەوە، خۆی کرد بەپۆلەکەماندا، بێدەنگی باڵی بەسەرماندا کێشـا و سـەرمان رووەو زەوی نەوی کرد و کەوتینە خوێندنی "ئایەتول کورسی" تاکو پشکێنەر نەمان بینێ.
پشکێنەر کەوتە پشـکنینی دەفتەرەکانی هەندێکمان، هیچ هەڵەو کەم وکوڕیەکی تیا بەدی نەکرد، بە مامۆستای گوت:
ـ سوپاست دەکەم مامۆستا، قوتابییەکانت زیرەك وچەلەنگن پێدەچێ زۆر ماندبوویتی لەگەڵیان....
ترس توشی نیگەرانی ودڵە راوکێی کردم، بەبێ هیچ هۆیەك لاپەڕەکانی دەفتەرەکەم هەڵدەدایەوە، لەناکاو تەماشـام کرد پشکێنەر وەکو چیایەکی بڵند لە بان سەرم وەستاوە، بەترس ولەرزەوە دەفتەرەکەم بەرز کردەوەو کەوتمە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی...
پشکێنەر وتی: ئەم دەفتەرە چییە؟ وچیت تێدا تۆمارکردووە؟
وەڵاممدایەوە : گەورەم پارچە هۆنراوەیەکە!
وتی: ئەمە چۆن شیعرێکە؟
گوتم: مامۆستا بۆمانی نووسیوەتەوەو راڤەشی کردووە!
کە روانیمە لاپەڕەی دەفتەرەکەم، بینیم پرسـیاری بیرکاریەکەم نیشـان پشـکێنەر داوە، نەك ئەو پارچە هۆنراوەیەی کە لەسەر تەختە رەشەکەوە

نووسیبوومەوە.
پشکێنەر بە تۆزێ رقەوە وتی: باشە ئەدی کوا هۆنراوە!
بە ئاسـپایی نیگایەکی مامۆستاکەمم کرد، رەنگی ببوە لیمۆی زەرد، هەوڵمدا ئەو لاپەڕەیە بدۆزمەوە کە پارچە شـیعرەکە و شیکردنەوەکەیم تیادا نووسیبوو، مامۆستاش بەچاو وبەبرۆکانی ئاماژەی بۆمن دەکرد، هەرچەنێ بەخۆمدا چوومەوە وتێفکریم لە مەبەسـتی تێنەگەیشـتم، پشکێنەریش چاوەڕێی وەڵامی منی دەکرد، وئەزیش بەزمانێکی قورس وبەتۆنێکی تێکەڵ بەترس ولەرزەوە پێیم گوت:
من نەمتوانی شیعرەکە بنووسمەوە!
پشکێنەر بەمامۆستاکەی گوت: با پرسیارێکی بیرکاریان بۆبێنمەوە تاکو وەڵامی بدەنەوە...
لەبەر ئەوەی پشکێنەر پرسیارەکەی پێشووی لە لای من بینی بوو، بۆیە ناچار پرسـیارێکی تری لێمان کرد.. زۆربەی قوتابییەکان نەیانتوانی وەڵامی راست ودروسـت بدەنەوە، منیش لە شەرمەزاریدا گیانم کەوتە لەرزین، چونکێکم من ئەو گۆبەندەم نابووەوە، وکەسیشـیان نەیاندەتوانی وەڵام بدەنەوە، دەبوو هەرخۆم وڵامی پرسـیارەکە بدەمەوە، بۆیە بروسکە ئاسا لەجێی خۆمەوە هەستام.
پشکێنەر پرسیاری لێم کرد، تەمەنت چەندە؟
شاڵاوی ترس ونیگەرانی وایان لێم کرد، لەپرسیارەکە وررد نەبمەوە وبەڵکو هزرم تەنها لای وڵامەکانی مامۆستا بوو، وەڵامیمدایەوە:
١٤٩٢ ساڵ !!گەورەم
لەتوڕەیی و سـەر سوڕمانیدا، هەردوو چاوی پشکێنەر زەق بووەوە، وەکو گڕکان ئاگریان لێدەباری، دووبارە پرسیەوە:

ـ ئەرێ ئەوە تۆ دەڵێی چی ؟ پێتم گوت تەمەنت چەندە؟
هەتا هێزم تیابوو هاوارم کرد، **١٤٩٢**ساڵ!
زەردەیەکـــی تاڵی کرد، وامزانی وەڵامی دروســـتم داوەتەوە، بۆیە کەیفم هاتێ ونەختێ ترس لەدڵما رەوییەوە، دیسان پرسیاری کردەوە:
ـ کێ شاری ئەستەنبوڵی رزگار کرد؟
زەینم نەدابووە، ریزبەندی وەڵامەکان: بەدەنگێکی بەرز گوتم: باوکم!!
هەموو قوتابیانی پۆلەکەمـــان بەیەکەوەو بەیەك دەنگ دایان لەتریقەی پێکەنین...
پشکێنەر مشتێکی دایە بان مێزەکەو گوتی:
ـ کوڕی خۆم وتم کێ ئەستەنبوڵی رزگار کرد؟
لەبەر ئەوەی شپرزەو شێوا بووم، ئیدی تێنەگەیشتم ئەو هەڵەیەی کردوومە چەند گەورەیە، ونەمزانی چ دەستە گوڵێکم بەئاوداداوە، بۆیە دووجاران لەسەر یەك وتم:
باوکم...باوکم... گەورەم جەنابی پشکێنەر!
پرسیاری لێم کردەوە: ئەرێ پێم ناڵێی ئەم باوکەی تۆ کێ یە؟
بەپێی ئەو ریزبەندییەی، کە وڵامەکانم پێی ئەزبەر کردبوو، بەرسڤیمدایەوە:
ـ تەلارساز سینان!!
پشکێنەر وایزانی شۆخی پێدەکەم بۆیە تاهێزی تیابوو هاواریکرد و وتی:
ـ تۆ دەزانی چی دەقەوچی؟
گوتم: بەڵێ....دەزانم!!
ئیدی پۆلەکەمان یەکپارچە بوو بە هەراوگۆڵمەز وقاقای پێکەنین لەژێر رەحلەکانەوە تا دەهات بەردەوام وبەرزتر دەبووەوە، مامۆســـتای داماویش هەردوو پێی لەشـــوێنی خۆی چەقی بـــوو، نەیدەتوانی هیچ جوڵەیەك

بکات، هەوڵیدا لە پێش جەنابی پشکێنەر هەڵەکانم ڕاست بکاتەوە، لەسەر خۆ و بەنەرمیەوە وتی:
- گەورەم جەنابی پشکێنەر لەهەمبەر بەڕێزتان زۆر پەشۆکاوە، لێگەڕێ با من پرسیاری لێبکەم، بەو پەڕی لوتفەوە پرسیاری لێمکرد: کوڕی شیرینم هەموو هەست هۆشت لای من بێ، سینان چ کارێکی درەوشاوەو درەخشانی کرد؟
هەر بەو پەشۆکاوییەوە وەڵامیمدایەوە: هەستا بە رزگار کردنی شاری ئەستەنبوڵ.
- ئەدی باشە کێ مزگەوتی سولەیمانییەی دروست کرد؟
بەرسڤمیدایەوە: سوڵتان محەمەد فاتیح دروستی کرد!
پشکێنەر زۆر توڕەبوو، بەهەموو هێزو توانایەکییەوە شیڕاندی:
- هەی گەمژەو هێڕ، هەموو کەسێك دەزانێ سوڵتان محەمەد فاتیحی تەلارسازی بەناوبانگ کیشوەری ئەمەریکای دۆزییەوە!
کاتێك پشکێنەر ئەم هەڵە ئابڕووبەرەی کرد، بۆمبێك لە پێکەنین لە بنمیچی پۆلەکە تەقییەوە .. سەدای قاقای پێکەنینی قوتابییەکان گەیشتە هەموو پۆلەکانی تری خوێندنگەکە، پشکێنەر هەستی کرد هەڵەکەی خۆی لەوەی من مەزنترە، ئەویش لەشوێن خۆیەوە پێکەنی، ویستی هەڵەکەی خۆی چاك بکاتەوە، وتی:
- من مەبەستم ئەوەیە (سلێمان)ی تەلارساز خۆی مزگەوتی سولەیمانییەی دروست کرد...
قوتابییەکان بەدەنگێکی بەرزتر دایان لە قاقای پێکەنین، کاتێ پشکێنەر بینی گەمژەییەکەی خۆیشی ئاشکرا بوو، دووبارە هاتەوە سەرم وداخی دڵی خۆی بەمن دەرکرد، تا توانی مشتێکی کێشا بەسەرما، وئینجا

وتی: گـــەوج وحۆلە تۆ منت بەهەڵەدا برد... ئەمەی وت و بەخێرایی لەپۆلەکەمانەوە دەرپەڕی.
مامۆســـتا لەنزیك دیوارەکە وێستا بوو، بە واق وڕمانەوە سەرێکی باداو بەدڵێکی پڕ لە خەم وحەسرەتەوە تاتوانی تفێکی کردە سەر زەوی، ئیدی کەس نەیزانی:
تفی لەمن، یان لە پشکێنەر، یاخود لەخۆی کرد!!
یانیش لەو رۆژگارەی، توشی ئەم سەرلێشێوان و رۆژە رەشەی کرد.

سوپاس بۆ خوا
بەڕێوەبەرسەلامەتە!

# سوپاس بۆ خوا بەڕێوەبەر سەلامەتە!

لەبەر ئـــەوەی بەڕێوەبەری کارگێڕی توشـــی رووداوی هاتوچۆ ببوو، هەمـوو کارمـەندانی کۆمپانیا گەورەکە گردەوە بوون. رووداوەکە چنەبوو. لەو کاتەی بەڕێوەبەر ئۆتۆمبێلەکەی دەهاژوو لەماڵەوە بەرەو شـــوێنی کارەکەی دەچوو، ئۆتۆمبێلێکی گواســـتنەوەی گشتیی بچوك لەدواوە بەهێواشی خۆی پیاکێشا بوو، تۆزێك بۆ دیەکەی رووشاند وزیانی بچوکی بە ئۆتۆمبێلەکە گەیاند بوو...

بەرپرسیارێتی رووداوەکە کەوتە ئەستۆی شوفێری ئۆتۆمبێلی گواستنەوە گشـــتییەکە، ئەویش ئامادەیی خۆی دەربڕی بـــۆ قەرەبوو کردنەوەی زیانەکە...سەرباری ئەوەی کۆمپانیای دڵنیابوون لەسەر بودجەی خۆی ئۆتۆمبێلەکە چاك دەکاتەوە. هەمـوو شتەکان بەرێك وپێکی بەڕێوە چوو، وەلێ لەبەر ئەوەی بەڕێوەبەری کارگێڕی نیگەران و شپرزە ببوو ئەو رۆژە نەچوو بۆ سەر کارەکەی و مایەوە لەماڵ تاکو پشوو بدات.

بەڕێوەبەری کارگێڕی بە بەرپرسێکی گەورەو دەست رۆ دێتە هەژماردن، هەر فەرمانێك دەر بکات خێرا جێ بەجێ دەکرێت. سەرجەم کارمەندەکان

لێی دەترســـن وهەموو داواکارییەکانی جێ بەجێ دەکەن. چونکی هەر خۆی بەرپرسی گواستنەوەو بەرزکردنەوەی پلە وپایە و دامەزراندن ومووچە زیاد کردن و ترۆکردنی کرێکارەکان وشتی تریشە. سەرجەم کارمەندەکانی کۆمپانیاکە سەرقاڵی ئاریشەکە بوون، لەناو خۆیاندا کەوتنە قسەو باس ودەیانگوت:
ـ چی روویداوە؟....چی روویداوە؟...راســـتە بەڕێوەبەر توشی رووداوی هاتوچۆ بووە؟..
ـ بەڵێ ئەم بەیانییە توشی رووداوی هاتوچۆ بووە.
ـ وای ...وای.. لەنەخۆشخانەیە وانییە؟..
ـ نەخێر لەماڵی خۆیانە..
هەلێکی زۆر باشە بۆ دڵ رازی کردنی بەڕێوەبەری کارگێڕی و سەرنج راکێشـــانی بە لای خۆیاندا، ئافرەتە کرێکارەکان دەســـتیان بەرشتنی فرمێسکی درۆزنانەو تیمساحیانە کرد، چونکێکم دڵنیابوون هەواڵی ئەم گریانەیان دەگاتە بەڕێوەبەری کارگێڕی. کرێکارە پیاوەکانی کۆمپانیاکەش زۆر دڵتەنـــگ بوون وکەوتنە کێ بڕکێ لە نێوان خۆیاندا، هەرکەســـەو هەوڵی دەدا، خۆی وانیشـــاندا لەهەموو کـــەس نزیکترە لە بەڕێوەبەری کارگێڕی، هەر کەسەو بڕوای وابوو لەهەموو کەسێ زیاتر زانیاری لایە لە بارەی رووداوەکەوە.
ـ رووداوەکە جەرگ بڕە؟..
بۆ ئەوەی خۆی وانیشاندا کە بزانن چەنێ لە بەڕێوەبەری کارگێڕییەوە نزیکە یەکێك لەکارمەندەکان بەزمانێکی بڕوا بەخۆبوونەوە وتی:
ـ بێگومان رووداوێکی جەرگ بڕە. ئەم ئۆتۆمبێلەکەی دەهاژوو لە دواوە ئۆتۆمبێلێکی زەبەلاح بە تیژی خۆی پێادا کێشاوە. ئیدی خۆت بیهێنە

بەرچاوت..
هەرکەسێك گوێی لەم وڵامە بێت لە ئۆتۆمبێلێکی گواستنەوەی بچوك بۆ ئۆتۆمبێلێکی گواستنەوەی گەورە وبەتیژی لە دواوە ئەوە ئۆتۆمبێلەکەی بەڕێوەبەری وێران کردووە!...
بەو پێیەی ئەو نزیکترین کەســـە لە لەبەڕێوەبەر، پشکنینی ووردتری بۆ رووداوەکە کردووەو زانیاری تەواوی لایە..بۆیە قەبارەی لە ئۆتۆمبێلێکی گواســـتنەوەی بچوکەوە گۆڕی بۆ گەورەو درێژ. دەمەو بەیانی بەرەو کارەکەی دەچوو، ئۆتۆمبێلێکی گەورە کێشەکەی (١٠) تەن دەبوو خۆی پیاکێشا.
- باشە ئەدی بۆچی نەیان برد بۆ نەخۆشخانە؟..
- هەر کەسێك توشی رووداوێکی جەرگ بڕی وا ببێت، دەکرێ دەسبەجێ بگواسترێتەوە بۆ نەخۆشخانە؟..
سەرزنشـــتی خۆیانیـــان دەکرد لەبەر ئەوەی یەکســـەر نەیـــان گەیاندە نەخۆشخانە، لەبەر نەزانیان لەم جۆرە کارانە پیشیان دەخواردەوە...
- ئەوەی تۆ دەیڵێی تەواوە ئازیزم. منیش ســـەرم لەم کارە ســـوڕما بۆیە ئەم پرســـیارەم لێت کرد..وەلێ مافی خۆتە..پێویســـتە نەختێ بە ئاگا بێتەوە دواتر بگوازرێتەوە. وانییە؟. لەوەیابوو گشت کارەکانی کۆمپانیاکە بوەستێ، چونکی لە قسەکردن لە رووداوەکە زیاتر هیچ خەمێکی تریان نەبوو، کەســـیش نەی دەوێرا بڵێ: "لەم قســـانە گەڕێن وهەر کەســـەو گرنگی بەکارەکەی خۆی بدات" چونکی ئەمجۆرە قسانە نزم کردنەوەی کەسایەتی بەڕێوەبەر دێتە هەژماردن. یەکێکیان ویستی لەوانی تر خۆی بەدڵســـۆزتر نیشان بدات، دەســـتی بۆ تەلەفۆنەکە درێژ کردوو لەگەڵ بەڕێوەبەر کەوتە ئاخاوتن.

ـ سوپاس بۆ خوا و بۆ سەلامەتیت گەورەم. زۆرم خەم خوارد. هاوکارانیشم هەروەتر، وەلیٚ بەندەی موخلیستان بەبیستنی هەواڵەکە توشی شۆك بووم، ونەشم دەزانی چی بەمن دەکریٚ تاکو بیکەم؟..

وای ..وای ..تکات لێدەکەم زۆر ئاگات لەخۆت بێت ..چیتان پێویستە بۆتانی بکەم گەورەم؟..تەلەفۆن لـــە ماڵی بەڕێوەبەر بۆ چرکەیەکیش وەســـتانی نەبوو. سەرەتا بەڕێوەبەر هەستی بەدڵخۆشی دەکرد، چونکی ئەم هەواڵ پرسینە ئەوە دەگەیەنیٚ بەڕێوەبەر کەسێکی خۆشەویستە لای هەمـــووان ..وەلیٚ لەبەر ئەوەی زۆر بیزاریـــان کرد، کەوتە وڵامدانەوەی ناشایستە کاتیٚ پێیان دەگوت: سوپاس بۆ خوا و بۆ سەلامەتیت، ئەویش دەیگوت:

ـ من هیچم نییە. ئێوە شتەکە گەورە دەکەنەوە..

ئەو کارمەندانەی گرنگیان بە مەســـەلەکە دەدا ئەم وڵامەیان پیٚ خۆش نەبوو..

ـ تکایـــە گەورەم چـــۆن دەڵێی هیچ لە گۆڕێدا نییـــە. بۆیە وادەڵێی: چونکێکم ماشەڵات لێبیٚ خۆت کەسێکی ورە بەرزی. دەنا ئەوەی بەسەر تۆدا هات بەسەر هەرکەسێکی تردا بهاتبا لەمێژبوو مردبوو..

هەرکاتیٚ تەلەفۆن بکرایەو بیانگوتبا سوپاس بۆ خوا و بۆ سەلامەتیت، بەڕێوەبەری کارگێڕی هێندەی تر پەست دەبوو..

ـ برای بەڕێزم من تەندروستیم باشەو، لەو پەڕی ساغیدام.

ـ چۆن وادەڵێی گەورەم . کامیۆنێك کێشەکەی (١٠) تەن بێت وبەتیژی خۆی بکێشێت بە ئۆتۆمبێلەکەتدا، نا بێت هیچ لە گۆڕێدا نەبێت. تکات لێدەکەم نەکەی لەجێگای خۆت هەستی..

کەســـانێك هەن زۆر لەوانە زیرەکترن کە بە تەلەفۆن پەیوەندیان پێوە کرد،

چونکی ئەمان دەستیان لەکارەکانیان هەڵگرت وسەردانی ماڵی بەڕێوەبەری کارگێڕیان کرد..لەبەر ئەوەی سەردانی کەسێکی توشی رووداو وبریندار دەکەن، پێویســـتە لەگەڵ خۆیان دیاری بەرن وەکو: شوشەی کۆڵۆنیا، گوڵ، پاکەتی شیرینی، یاخود نوقڵەترشە یانیش میوەجاتی وشکەوەبوو.. هەینـــێ بەڕێوەبەری کارگێڕی بە میوانەکانی گوت: من هیچم نییە، یەکێك لە ئامادەبووان وڵامیدایەوەو وتی:

ـ تکا دەکەم..پێویستە زۆر ئاگات لە خۆت بێ گەورەم جەنابی بەڕێوەبەر، چونکی رووداوی پێکدادان ئاکامەکەی یەکسەر بەدەر ناکەوێ..لەکاتێکدا تۆ واهەست دەکەی هیچ نییە لە گۆڕێ، رەنگە پاش هەفتەیەك یاخود (١٠) رۆژیتر شـــوێنەوارەکەی وەدەر کەوێ. ئیدی لەبەردەمیا کەوتنە گێڕانـــەوەی چەند چیرۆکێکی جۆراو جـــۆر . بۆنموونە گەر درزێکی بچوك لەسەرتدا هەبێت زۆر درەنگ بەدەر دەکەوێ...

پێکدادانەکە رۆژی هەینی* روویدا بەڕێوەبەریش پێی باش بوو ئەو رۆژە لەماڵ بمینێتەوە وپشوو بدات و رۆژی شەممە بچێ بۆسەر کارەکەی. وەلێ ئەم هەموو تەلەفۆن وســـەردانی کردنانەو ســـوپاس بۆ خوا و بۆ سەلامەتیت گەورەم و داوای هەرچی چاکبوونەوەی زووترە..رەنگدانەوەی ئەو کەســـانەن کە گرنگی بە رووداوەکـــە دەدەن.وای لێکرد پاش گەز بێتەوە لەوەی دوو ســـبەیش بچێت بۆ سەر کارەکەی چونکی کارێکی نەشیاوە، بەڵام گەر رۆژێکی تریش بداتە دەمیەوە بەو جۆرە ڕێز لەهەستی میوانەکانی دەگرێت. بەهەر حاڵ رۆژانی شـــەممە خۆی نیوە دەوامە. بۆیە بڕیاریدا رۆژی شـــەممە و یەك شەم پشوو بدات و رۆژی دووشەم بچێت بۆ دەوام . بەڵام ماستاو چییەکان رۆژانی شەممەو یەکشەمیش هاتن بۆماڵیان تاکو پێی بڵێن: سوپاس بۆ خوا و بۆ سەلامەتیت. بەوەشەوە

نەوەستان وچون پزیشکی کۆمپانیاکەشیان هێنا تاکو پشکنینی بۆ بکات . بەڕێوەبەری کارگێڕی زۆر سـەری سـوڕمابوو لەو هەموو هەست وخۆشەویستی لەڕادەبەدەری هەموو کارمەندانی کۆمپانیاکە دەریدەبڕن. بۆیە شەرمی دەکرد بڵێ: من تەندروستیم باشەو ساغ وسەلامەتم. وەلێ دەربڕینی ئەو هەموو هەست ودڵسۆزییە لە پای چی؟. لە پێناوی رازی کردنی دڵی میوانەکانی، بەڕێوەبەر کەوتە گازندەکردن لەئێش وئازارەکانی. روی لێیان کرد و گوتی: جومگەکانی هەردوو شانم زۆر ئازاری هەیە، هەست بە ژانێکی قوڵ دەکەم لە جومگەکانی رانم .

ـ بڕبڕەی پشتت چۆنە جەنابی بەڕێوەبەر؟..

ـ ئاە. پرسیاری ئازاری بڕبڕەی پشتم هەر مەکەن، هەست بەشتێکی نامۆ دەکەم ونازانم چۆنی وەسف بکەم...

ـ بێگومان گەورەم، ئۆتۆمبێلێکی گەورەو کێشـی دە تەن و بەتیژی لە پشتەوە لێت بدات ئازارو ژانت هەر دەبێت.

تا دەهات میوان لە زیاد بووندا بوون، بۆیە بەڕێوەبەر بەشـیاوی نەزانی هەستێتە سەر پێ و لەناو ژوورەکەدا بەبەر چاویانەوە بێت وبڕوات . سەرەتا لەکاتی پێشـوازی میوانەکاندا چەرچەفێکی تەنکی دەدایە بان خۆیا و خۆی بە کورسـیەکەوە دەگرت. پاشان وای بە چاك زانی لەسەر جێگا درێژ بێت، ئەمەش مانای ئەوەیە رۆژی دووشەممەش ناتوانێ بچێ بۆ سەرکار . رۆژی سێ شەممە بروسەکەیەکی لە بەڕێوەبەری گشتییەوە پێگەیشت ودەڵێ: سـوپاس بۆ خوا و بۆ سەلامەتیت، رۆژی چوارشەم هەموو رۆژنامەکانی شار هەواڵی ئەم رووداوەیان بڵاو کردەوەو بە یەکێك لە رووداوە گرنگەکانیان دایە قەڵەم. تا دەهات مەسەلەکە جددی تر دەبوو و بەڕێوەبەری کارگێڕی وای لێهات نەیدەتوانی لەماڵەکەی بچێتە دەرەوە

..تەنانەت ئەو پزیشکەی پشکنینی بۆ ئەنجامدا لە راپۆرتەکەیدا نووسی بووی دەبێ پانزە رۆژ لە ماڵی خۆی پشوو بدات.
پانزە رۆژیش بەسەر چوو وەلێ بەڕێوەبەری کارگێڕی لە سەر جێگا هەڵنەستا. تۆبڵێی راهاتبێت لە گەڵ نەخۆشی ؟..یاخود بەڕاستی نەخۆشە. خۆی هەر دەیگوت : من تەندروستیم زۆر باشە. وەلێ ناچاریان کردووم نەخۆش کەوم !..ئایا دەبێ کەوتبێتە ژێر کاریگەری وتە وتی دەڵەچەو ماستاوچییەکان؟. وا پێناچێت وابێت، چونکی رۆژ بە رۆژ جەستەی لاواز و بێ هێز دەبوو.لە خواردن وخواردنەوەیشی کەوتبوو. لەکاتێکدا میوانە ماستاو چییەکانی دەیان گوت: سوپاس بۆ خوا و بۆ سەلامەتیت گەورەم، ئەمیش تەنها بۆ ئەوەی دڵیان رازی بکات بەردەوام دەیگوت: ئێرەو ئەوێم دێشێ وهەست بەژانێکی بێ شومار دەکەم..کەچی بەڕاستی بەڕێوەبەری کارگێڕیان گواستەوە بۆ نەخۆشخانە..
ئێستا وا قسە لەسەر باری تەندروستی بەڕێوەبەری کارگێڕی دەکەن گوایە دەکەوێتە ژێر نەشتەرگەریەکی گەورەو ترسناك ..وهەر یەکەو دەیگەڕێنێتەوە بۆ هۆکارێك، یەك دەڵێ: بە هۆی ئەو نەخۆشییەوەیە،کە هەمیشە پێوەی دەناڵاند، یەکێکی تر دەڵێن: لە ئاکامی رووداوەکەیە. هەندێکیان دەڵێن: ساغ وسەلامتە و
کاسە لێس وماستاوچییەکان ناچاریان کردووە بەزۆر نەخۆش کەوێ. وەلێ هەندێکی تریش دەڵێن: ئەم نەشتەر گەرییە پەیوەندی بە رووداوی هاتوچۆکەوە نییە. وەلێ بەڕێوەبەری کارگێڕی نەخۆشییەکی ترسناکی هەیە!..دەبێ رای کامیان راستتر بێت. بە دڵنیاییەوە نەزانراوە..

*** لە تورکیا رۆژانی یەك شەمە پشووی فەرمیە، نەك هەینی! "وەرگێڕ"**

# رزگارمان نابێت لەپۆلیسخانە!

پێش هەموو شتێك كاك نورەدین ئۆتۆمبێلێكی كڕی وبڕیاریدا گەشتێك بكا بۆ ئەوروپا، بەر لە هەر شوێنێكی تر سەردانی سویسرا بكات..
لە مێژبوو بیری لەم گەشتە كردبۆوە، وەلێ بارو دۆخەكەی نەدەگونجا، لەكۆتاییدا و لەپاش ئەوەی ئاواتەكەی وەدی هات، وئۆتۆمبێلێكی سپۆرتی كڕی وپارچە یەدەكی بیانی پێویستی دەست دەكەوت، لە سەرەتای هاویندا دەستی بەگەشتەكەی كرد، بەو هیوایەی هەر هیچ نەبێ لە مانگ ونیوێك كەمتر نەخایانێت، لە كاتی بەڕێ كردنیدا بەكەسوكار و هاوڕێیانی وت:
ـ بمبەخشن گەر نەمتوانی نامەتان بۆ بنێرم. وەلێ بگەمە هەر شوێنێ پۆسكارتێكی ئەو شوێنەتان بۆ ڕەوانە دەكەم.
بەڵام هیچ نامەو كارتێكی نەنارد!..
كەسێك بچێت بۆ ئەوروپا چۆن دەبێ پۆسكارتێكی ڕەنگاو ڕەنگ نەنێرێتەوە بۆ هاوسەرەكەی یاخود بۆ هاوڕێكانی؟ ئەوەی ئەم كارە نەكات نازانێ چێژی گەشت كردن بۆ ئەوروپا چییە.. گەر دەتەوێ سەفەرێك بكەی بۆ

ئەوروپا رێنمایی ژمارەی تەلەفۆن وناونیشانی شارەکانی ئەستەمبووڵ و ئەنقەرەو ئیزمیر لەگەڵ خۆتدا بەری، دواتر دەبێ کۆمەڵێ پۆسکارتی رەنگاو رەنگی ئەو شارانە بکڕیت، کە سەردانی دەکەیت وکە گەڕایتەوە بۆ هوتێل وبەپێی تۆماری رێنمایی ناونیشـــان و تەلەفۆنی شارەکان بۆ ناونیشـــانەکانی هەموو ئەوکەسانەی دەیان ناســـی ونایان ناسی سەرو پۆسکارتێك دەنیری تاکو هەموو کەسێ بزانێ تۆ چویتە بۆ ئەوروپا!..

پێویستیشـــە لە پشتی پۆســـکارتەکەوە بنووســـی "لە گەڵ رێزمدا لە ڤینیســـیاوە"،"لە گەڵ ریزمدا لە زیوریخەوە"، "یادگارییە لە پاریسەوە" دەبێ کەس نەمێنێ و نەزانێ سەفەری ئەوروپات کردووە، لەبەر ئەوەی چوونە ئەوروپا ئەو هەمـــوو ماندوو بوونە دێنێ. وکاتێکیش گەڕایتەوە بۆ نیشتیمان تا لەژیاندابی دەبێ بەردەوام باسی گەشتەکەت بکەیت بۆ ئەوروپا..

ـ خودایەگیان رۆژانێکی چەند خۆش بوو..

ـ کاتێ لە ئەوروپا بووم..

ـ ئەوە، ئەو کاتە بوو لە ئەوروپا دەگەڕامەوە...

ـ ئـــەوە تۆ دەڵێی چی گیانی من، ئەوروپا بەتەواوەتی شـــتێکی زۆر جیاوازە..

ـ ئێمە هەرگیز وەك ئەوروپییەکان نابین بە پیاو..دەبێ هەریەکێ لەئێمە (١٠) خەرەوار نان بخوات ئینجا دەبین بە پیاو...

کەچی نورەددین هیچ شـــتێکی لە مانە نەکـــرد، چونکی مرۆڤێکی گەمژەیە، گەر من لە جێگای ئەو دەچووم بۆ ئەوروپا، ئینجا دەتانزانی گەشـــت کردن چۆنە بـــۆ ئەوروپا!. لووتم بەرز دەکـــردو بەتیلەی چاو دەمڕوانییە دەوروبەرەکەم تاکو ئەوەی بمبینێ یەکسەر لێم تێبگاو بڵێ:

ـ ئەم پیاوە گەشتی کردووە بۆ ئەوروپا..
پاش بیست رۆژان نورەددین گەڕایەوە لە سەفەرەکەی پرسیاریان لێکرد:
ـ بۆ وا زوو گەڕایتەوە، بڕیار نەبوو مانگ ونیوێ لەوێ بی...
ـ تکات لێدەکەم پرسیار مەکەو دەمت داخە. بە زۆر رزگارم بوو..
ـ باشە بۆ تاقە پۆسکارتێکت نەنارد..
ـ کاتی ئەوەم نەبوو تاقە کارتێکیش بنێرم..
ـ کەواتە کاتێکی زۆر خۆشت بردۆتە سەر!..
ـ کاتــی خۆش ئەوە تۆ باســی چی دەکەی؟..هەمــوو کاتەکانم لە پۆلیسخانەکان بردە سەر، ونەمتوانی هیچ شتێك ببینم.
ـ بۆ؟. ئایا (پۆلیسی ئەنتەرپۆل) گومانی لێت هەبوو، کە تۆ یەکێکی لە خاوەن رابردووە خراپەکان؟..
ـ هەرگیز..دوایی بۆتی دەگێڕمەوە، کە چیم بەسەر هاتووە. پاش ئەوەی بەڕێ کەوتم وسنووری وڵاتانی (بەڵقان)م بڕی، هەموو شتێك ئاسایی بوو، وەلێ هەر هێندەم خۆش بوو گەیشــتمە سنووری وڵاتانی سویسراو نەمسا ئیدی هەموو شتێك گۆڕا. بە ئاسانی سنوورم بڕی وپاش ئەوەی کیلۆمەترێکم بڕی پۆلیسێکی هاتوچۆ رێی پێ گرتم وپێمی گوت:
ـ بە یارمەتیت، فەرموون لە گەڵما بۆ پۆلیسخانە.
چووم بۆ پۆلیسخانە بەڵام پاش ئەوە ئیدی رزگارم نەبوو لە پۆلیسخانە. پۆلیسەکە بۆیە رای وەســتاندم چونکە لایتە هیلۆجینەکەی پێشەوەی ئۆتۆمبێلەکەم لە کار کەوتبوو، پێیانم گوت:
ـ لایتەکەی ترم کار دەکات لەمە زیاتر چیتان دەوێ. ئەمە چاکتر نییە لەوەی دوو لایت ئیش بکات؟..
ـ تەماشای ئۆتۆمبێلەکەت بکە دوو لایتی هیلۆجینیان بۆ داناوە، گەر

یەك دانە بەشی بکردایە، هەر یەکێکیان بۆ دروست دەکرد..
دواتر تەماشایەکی روخسارمی کرد ولێی پرسیم:
- واپێدەچێ تۆ بیانی بیت!..
- بەڵێ.
- دیارە.
لایتەکانم چاك کرد و دەســـتم بەگەشتەکەم کردو بەرەو زیوریخ، هەر کە رێگام گرتە بەر یەکێك لە پیاوانی پۆلیس رایگرتم.
- فەرموون بۆ پۆلیسخانە.
لە دەروازەی شار سنووری خێرایت بەزاندووە!.
- رێگاکە دوور و درێژەو هیچ بەرزو نزمییەکی تێدانییە، ئیدی بۆ خێرا نەهاژووم، دواتر هیچ پێکدادانێك رووی نەداوە. ئەفسەری پۆلیسخانەکە تەماشایەکی کردم و وتی :
- تۆ بیانیت؟..
- بەڵێ.
- ئەمە روون وئاشکرایە، سەر چاوان هاتی.
- سوپاس، گەورەم.
هەرکە چوومە ناو شارەوە پۆلیسێکی تر رایگرتم:
- بابڕۆین بۆ پۆلیسخانە.
- هۆکار چییە؟
- لەبەر ئەوەی لەکاتی پێچدانەوەت هێمات هەڵنەکرد بوو!..
پێویستە زیوریخ لە مێشکم دەرکەم تاکو لە پۆلیسخانەکان رزگارم بێت. بڕیارمدا بچم بۆ بێرن، وهەر کە چوومە ناو شارەوە سەرنجی هیچ شتێکم نەدا ..

ـ فەرموو بۆ پۆلیسخانە.
سەرپێچییەکەی من ئەوە بوو، لەلای چەپەوە ئەو پاسەم رەتدا کە لەپێشمەوە دەڕۆیشت.
ـ هیچ بەر بەستێك لە رێگاکەم نەبوو!..
ئەفسەرەکە تەماشایەکی کردم و پرسیاری لێمکرد:
ـ وابزانم تۆ بیانیت.
ـ چۆن زانیت؟..
ـ لە شکڵت رادیارە، بەخێر بێی.
بیرم لەمەسەلەکە کردەوە زانیم گەشتەکەم بە ئۆتۆمبێل پێ تەواو ناکرێ لە جێگایەك رام گرت راوەستان قەدەغەیە..پێمیان گوت: یاڵڵا بۆ پۆلیسخانە.. زۆر بێزار بووم، بڕیارمدا ئۆتۆمبێلەکە بفرۆشم تاکو لە کێشە رزگارم بێت. لەبەر ئەوەی تاکو لەلام بێت لە پۆلیسخانەی پۆلیس بەو لاوە هیچ شوێنێکی ئەوروپا نابینم. ئۆتۆمبێلەکەم فرۆشت و وردنەبوومەوە لە نرخی فرۆشتنەکەی هەرزان بوو، یاخود گران..
ـ بابڕۆین بۆ پۆلیسخانە..
ـ بۆچی؟! ئۆتۆمبێلەکە باشە وهیچ کەموکوڕییەکی تێدا نییە. پرسیاریان لێمکرد:
ـ چۆن بەم تیژییە دەهاژووی؟..
ـ من پشت بەخوا لێیدە خوڕم..
ئاماژەم بۆ (کیسەڵە نوشتە)* و ئەو تابلۆیەی کە لەپێشم هەڵواسراوەو لێی نووسراوە"ماشەڵڵا" وبۆ سورەتی "نەمل"و بۆ چاوەزارەکە و کوژەکە رەنگ چویتییە حەوتەوانەکە کرد. بەڵام بروایان پێم نەکرد.
ئۆتۆمبێلەکەم لە چۆڵەوانییەکدا بەجێ هێشت وبڕیارمدا سویسرا جێ

بهێڵم بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی تیا ببینم..
ـ فەرموون بۆ پۆلیسخانە..
لە باتی ئەوەی لەسەر شۆستەکە بڕۆم لە سەر شەقامەکە ڕێگام دەکرد..
بۆم دەرکەوت لە شـــاری بێرن ئۆخەی ناکەم، بڕیارمدا سواری پاس بم وبچم بۆ لۆزان.
ـ بابڕۆین بۆ پۆلیسخانە..
ـ تۆ بیانیت؟..
گوناهی من ئەوەبوو کاتێ چوومە ناو پاســـەکە ئەو پیاوەم ڕەتدا، کە لە پێشمەوە بوو. تکام لە ئەفسەری پۆلیسخانە کردو پێم گوت:
ـــ تکات لێدەکەم ڕێم بدە ســـەفەر بکەم بۆ لۆزان. گەیشـــتمە لۆزان..
هەرکەپیاسەیەکم کرد بەناویا.
ـ فەرموون بۆ پۆلیسخانە..
بڕوام پێبکەن هیچ گوناهێکم نەکردووە، تەنها ئەوە نەبێت پاکەتی جگەرە بەتاڵەکەم فڕێدایە ســـەر شـــەقامەکە. ئەرێ بابە گیان پێم ناڵێیت ئەو گوناهە گەورەیە چییە کردوومە!. نەکەسێکم کوشتووە و نە لە ناو شار و بە بەرچاوی خەڵکەوە کچێکم فڕاندووە !..
بۆم دەرکەوت، لە لۆزانیش ناتوانم بمێنمەوە بۆیە بڕیارمدا بچم بۆ جنێف بۆ ئەوەی چێژ لە جوانی ئەو شـــارە وەربگرم، بەڵام لێدەگەڕێن ئەم شارە ببینم؟..
ـ بابڕۆین بۆ پۆلیسخانە..
تفم فڕێدا بووە سەر زەوی ..ئەمە چییە؟. من تفم لە دەم وچاوی کەس نەکردووە تاکو شکاتم لێبکات..
ـ ئەفسەری پۆلیسخانە پێمی گوت:

ـ ئیێ..ئیێ..ئیێ . تێگەیشتم.
ـ لە چی تێگەیشتی؟..بەڵێ من بیانیم.
هەموو کون و قوژبنێکی سویســـرا گەڕام وەلێ لە پۆلیسخانە بەو لاوە هیچ شتێکی ترم نەبینی.
بە وشیاری و دیقەتەوە لە ڕێگاو بانەکان هاموشۆم دەکرد، تاکو هیچ سەر پێچییەك نەکەم و بەپێی یاسا سزا بدرێم. وەلێ برا گیان منیش مرۆڤم!.
میزم هات لە قوژبنێکی چۆڵ و لاچەپ گەڕام تەماشایەکی دیوارەکەم کرد لێی نەنووســـرابوو "هەی گوێدرێژ لێرە میز مەکە". مانای وایە لێرە میز کردن قەدەغە نییە..
ـ پێشم کەوە بۆ پۆلیسخانە.
شتێکی زۆر سەیرە برا گیان سویســـرییەکان خەڵکی باش دەناسن هەر تەماشای روخساری بکەن دەزانن نامۆیە، یان نا..
پاڕامەوە لێیان، وپێیانم گوت: بەناوی مرۆڤایەتی تکاتان لێدەکەم بمبەن بۆ دەرەوەی سنووری سویسرا..
برا گیان ئێســـتا زانیت بۆچی من کاتم نەبوو تاکو پۆســـکارتێکت بۆ بنێرم؟..
چوم بۆ سویسرا و هاتمەوە، بەڵام لە پۆلیسخانەکان بەو لاوە هیچی ترم نەبینی....

*** لە تورکیا لە زیو وپلاسکۆ کیسەڵی بچوك دروست دەکەن وبۆ چاوەزار دەیکەنە ملیـــان، یاخود لە ماڵان وناو ئۆتۆمبێل هەڵی دەواســـن. پێی دەڵێن: (کیســـەڵە نوشتە)"وەرگێڕ"**

# شوێنێکی دڵگیر

ماڵی دراوسێکەیان گواستیانەوە بۆ شوێنێکی دڵگیر، و شانازیشیان بەو جێگا خۆشەوە دەکرد.
ئەمانیش ویســـتیان بگوێزنەوە بۆ ئەو شوێنە دڵگیرەی کە دراوسێکەیان بۆی چوونە، وەلێ لە کوێ ئەم جێگا پەســـندە دەدۆزنەوە؟! ئەدی چۆن بۆی دەڕۆن؟!..
کەوتنە گەڕان بە دوای ئەم شوێنە دڵگیرە، بەڕێدا زۆر ڕۆیشتن، رووبار و گردۆڵکەیان بڕی، پیاوێکی بەساڵاچویان بینی، پرسیاری ئەو شوێنە دڵگیرەیان لێکرد، کە بەدوایدا دەگەڕێن، پێیانی گوت:
ـ بڕۆن و لای راست بگرنە بەر، دوایی بەلای راستدا وەرچەرخێن، لەلای راستانەوە توشی هەر رێگایەك بوون پیایدا بڕۆن.
رێگایان زۆر بڕی..رووبار و شـــاخیان بڕی، پاشـــان پیاوێکی ئالۆزیان بینی، پرسیاری ئەو شوێنە دڵگیرەیان لێکرد، کە بەدوایدا وێڵن، پێیانی گوت:
ـ بەلای راســـتدا بابدەنەوە و پاشان لای راســـت بگرن وهەرگیز دەست

بەرداری مەبن.
ئەوەیان جێ بەجێ کرد، وا پیاوەکە پێی گوتن، زۆر ڕێیان کرد..
دابەزینە دەشـــتایی وسەرکەوتنە سەر چیاکان، تیشکی خۆر سوتانیانی وباران تەری کردن، دووهاوین ودوو زســـتان بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن، لە کۆتاییدا دەرۆزە کەرێکیان بینی پرسیاری ئەو جێگا دڵگیرەیان لێکرد، کە بەدوایدا دەگەڕێن، پێیانی گوت:
ـ لای ڕاست بگرن، لەلای ڕاستەوە هەورازییەك دێتە ڕێتان
سەر کەون ودواتر بەلای ڕاست وەرگەڕێن، سواڵکەرەکە چی پێیان گوت جێ بە جێیان کرد، چەندین ڕۆژ و هەفتە و مانگ و ساڵ ڕێیان کرد..
دواتر ڕێکەوتی پۆلیسێکیان کرد، پرسیاری ئەو جێگا دڵگیرەیان لێکرد، کە بەدوایدا وێڵن، پێیانی گوت:
ـ گەر بەلای ڕاستدا بڕۆن لەلای ڕاستەوە گۆڕەپانێکی دەبینن، ببڕن، دۆڵێك دێتە پێشتان، بە ناوی دا بڕۆن. بەگوێی پۆلیسەکەشیان کرد، زۆر هەورازو نشێویان بڕی، هەڵکشان بەشاخدا وبیابانی بەرینیانیش زۆر بڕی، لە کۆتاییدا منداڵێکیان بینی، پرسیاری ئەو جێگا دڵگیرەیان لێکرد، کە بەدوایدا دەگەڕێن، پێیانی گوت: .
ـ بگەڕێنەوە بۆ ئەو سوچەی، کە کەوتۆتە لای ڕاستان، لەلای ڕاستەوە دارێك دەبینن هەر بەلای ڕاســـتی خۆتانەوە فەرامۆشی بکەن، وبەردەوام بن لەڕێکردن.
بەو ڕێگایەوە ڕۆیشتن، کە منداڵەکە نیشـــانیدان، دواتر چەرچییەکیان بینی، پرســـیاری ئەو جێگا دڵگیرەیان لێکرد، کـــە بەدوایدا دەگەڕێن، پێیانی گوت:
ـ بەلای ڕاستدا بادەنەوە و بەردەوام بن لە ڕۆیشتن، پێچی ڕێگایەك دێتە

ڕێتان، ڕێیەکەی لای ڕاست بگرن وپیابڕۆن، چۆنی پێیان گوت، ئاوهایان کرد، لای ڕاســـتیان گرت، بەردەوام بوون بەلای ڕاستدا، ڕۆیشتن بەلای ڕاستدا، دابەزین بەلای ڕاســـتدا، سەرکەوتن بەلای ڕاستدا، لە کۆتاییی ڕێیەکـــە ئۆتۆمبێلێکی تایبەتیان بینی پیاوێکی قەڵـــەوی لەناو بوو، پرسیاری ئەو جێگا دڵگیرەیان لێکرد، کە بەدوایدا وێڵن، پێیانی گوت:

ـ گەیشتن ئەوەتا لێرەیە.

ـ زۆر شادمان بوون.....ماندو بوونیان ڕەوییەوە.

دواجار... گەیشـــتنە ئەو جێگایەی وا ئاماژەی بۆیان کرد، لەســـەری وەستان، پاشان تەماشای دەوروبەری خۆیان کرد، کاتێ بە ئاگا هاتنەوە دەبینن گەیشـــتونەتە ئەو جێگایەی، کە پێشـــتر لێی دەرچون، هەستان وچوون لە جێگایەکی دڵگیر بگەڕێن.

بێگومان، دەیگەنێ، لەبەر ئەوەی کەسانی چاك ورێك وپێکن، وبەردەوام دەگەڕێن، بۆیە هەر بە ئامانجیان دەگەن...

# بەرخوردار بێت نیشتیمان

- ئاخ هاوڕێ گیان، گەر دەتزانی کێشەم چییە؟ من لەڕیزی زیندووان دانەنراوم! بە داخ و کەسەرەوە ئەمەی دەگوت، هەینێ لەگۆڕەپانی بەندیخانەی ناوەندیدا پیاسەمان دەکرد.
- بەتەنها نیت ئازیزم، کێ لەئێمە لە ڕیزی زیندووانە؟! سوپاسی خوا بکە بۆ هەموو شتێك،
لە ئێمەش خراپتر هەیە.
تەندروستیت، باشە ماشەڵڵا، هێندەت بەسە.
- نەخێر هاوڕێم، مەبەستم ئەوە نییە وا تۆ دەیڵێیت، بەکورتی من: مردووم..! چۆن بۆتی شیبکەمەوە؟...ئێستا تۆ منت بینیوە لەبەردەمتا، وانییە!بەڵام ئەمە هیچ مانایەك ناگەیەنێ، من هیچ بوونێکم نییە، من زیندوو نیم، من مردووم!ئازیزم وا تێنەگەی من شێتم یان خەڵافاوم، گەر لەنووکەوە بەسەرهاتەکەت بۆ بگێڕمەوە ئەوسا تێدەگەی:
بۆ یەکەمجار کە بەئاگاهاتمەوە من مردووم، دوانزە ساڵان بووم، بەڵێ دوانزە.

تا ئەوکاتە لە شارۆچکەکەمان قوتابخانە نەبوو.
منداڵان دەچوون بۆ حوجرە بۆ خوێندن، حوجرەی مەلا داود.
و کاتێــک یەکەمین قوتابخانەی ســەرەتایی میــری کرایەوە، خەڵکی شارۆچکەکە منداڵیان نارد بۆ خوێندن.
باوکم لە پیاو ماقوڵانی ناوچەکە بوو، ئەویش ویستی ناوم لە قوتابخانەکەدا تۆمار بکات.
باوکم لەگەڵ خۆی بردمی بــۆلای بەڕێوەبەری قوتابخانەکە، ئەویش داوای تۆماری بڕوانامەی لەدایك بوون، یاخود ئەوی پێی دەڵێن: دەفتەر نفوسی لێکردین. باوکیشم وەڵامی دایەوە.
- هێشتا دەفتەر نفوسم بۆ کوڕەکەم دەرنەهێناوە، نفوسەکەی من بەکەڵك نایەت بۆ کوڕەکەم؟!
بەڕێوەبــەر وەڵامی دایەوە: مەحاڵە...بەڵام باوکم مکوڕ بوو و پێی لێ داگرت وتی:
- بەڕێــز گیان جەنابی بەڕێوەبەر، بۆچی نابێ؟ تۆ چاك دەزانی هیچ جیاوازیــەك نییە لەنێوان من و کوڕەکەمدا، هەرچیم هەیە موڵکی تاقە کوڕەکەمە.
مەلا داود داوای دەفتەر نفوس ناکات، ئەم سووربونەتان لەپای چی؟
هــەر کە باوکم بۆی دەرکەوت بەڕێوەبەر بەهیچ شــێوەیەك ئامادە نییە بەبێ دەفتەر نفوس ناونووسم بکات، بەیەکەوە چووین بۆلای دادنووسی شارۆچکەکەمان، نووسراوێکی بۆمان نووسی وبردمان بۆ فەرمانگەی باری شارستانی.
فەرمانبەرێك لەباوکمی وەرگــرت، دەفتەری تۆماری ناوەکانی دەرکرد و لە پاش گەڕان و پشــکنینێکی درێژ خایەن ئنجا لاپەڕەکەی باوکمی

دۆزیەوە.
- ناوت ڕەشیدە؟
- بەڵێ.
فەرمانبەرەکە جارێکی تر ڕوانییە دەفتەرەکە و خوێندیەوە.
- مێژووی لەدایکبوونت، ١٨٩٧...ناونیشانت، گەڕەکی (دێرمان، دەخلە تاووس) ژمارەی گەڕەك (٥١)ی کۆن، (٢٨)ی نوێ...لەساڵی ١٩١١دا هاجەرت خواستووە و تاقە کوڕێکت هەیە بەناوی ئەمین...وانییە؟
- ڕاستە.
ڕووی دەمم لەباوکم کرد و پێم وت!
- بابە گیان، پێشتر ئەم پیاوە توی دەناسی؟ هەموو شتێك لەبارەی تۆوە دەزانێت !
باوکم وەڵامی دایەوە:
- کوڕی خۆم پێویستە هەموو شتێك بزانێت، کارمەندی میریە!
دواتر ڕووی لەفەرمانبەرەکە کردو وتی:
- دەمەوێ ناوی کوڕەکەم لە قوتابخانەی میری تۆمار بکەم، بەڕێوەبەری قوتابخانەکە داوای بڕوانامەی لەدایك بوونی لێمان کرد، دەمەوێ دەفتەر نفووسی بۆ دەربهێنم، لەکاتی خۆی فەرامۆشم کردو بۆیم دەرنەهێنا...
فەرمانبەرەکە بەگومانەوە ڕووانییە باوکم و وتی:
- کابرا! باس لەکام کوڕت دەکەی؟پێم نەوتی تەنها کوڕێکت هەیە و کوڕە تاقانەکەشت مردووە!
باوکم لەگەڵ وەڵامدانەوەی نیشـــانەی سەرسووڕمان وناڕازی بوون لە ڕوخساری بەدی دەکرا:
- ئەوە تۆ دەڵێی چی جەنابی فەرمانبەر؟ کوڕەکەم ئەوەتا لێرەیە (ئاماژەی

بۆ من کرد) زیندووەو دەخوا و دەژی.
فەرمانبەرەکە دیسانەوە دەستی بەخوێندنەوەی لاپەڕەکەی باوکم کردەوە:
- ناوت ڕەشیدە؟
- ڕەشید.
- ناوی باوکت محەمەدە؟
- بەڵێ ڕاستە.
- هاجەرت خواستووە کوڕێکت لێی هەیە بەناوی ئەمین؟
- بەڵێ، ئەمەش ڕاستە.
- مادامەکی تاکو ئێرە هەموو شتێك تەواوە لە تۆمارەکەت، بەپێی تۆمارەکەت دەرکەوتووە کوڕەکەت مردووە. ئازیزم ئێمەش بڕوانامەی لەدایك بوون بۆ مردوو دەرناکەین!
کەواتە مردووم بۆیە دام لە قوڵپی گریان، باوکم پەست بوو قیڕاندی بەسەرما و وتی:
- کڕ بە کوڕی خۆم، ئایا مرۆڤ بەوە دەمرێ تەنها لەتۆماری میریدا وا نووسرابێ؟
- ئێ فەرمانبەری میری دەڵێ گوایە من مردووم؟
- کوڕم تۆ زیندوی، من باوکتم و چاکتر دەزانم.
- ئێ هەرتۆش وتت فەرمانبەران هەموو شتێك دەزانن.
دووبارە گریام، فەرمانبەرەکە وتی:
ئەوەی لای من تۆمارکراوە هەر ئەوە ڕاستە، مەگەر پیلانێکتان لەژێر سەرا بێ، من چاکتان دەناسم، بڕوانامەی لەدایکبووی مردوتان نادەمێ.
باوکم بەتووڕەبوونەوە هاواری کرد:
- مەبەستت چییە لەوەی دەڵێی پیلانێکتان؟ ها؟

- زۆرم لەفرو فێڵەکانتان بیستووە، لەگەڵ موختار ڕێك دەکەون و مردوو زیندوو دەکەنەوە و زیندووش دەکەنە مردوو.
باوکم بەگاڵتەجاڕیەوە وەڵامی دایەوە:
- باشە پێم بڵێ کەی کوڕەکەم مرد؟
فەرمانبەرەکە تەماشایەکی تۆمارەکەی کرد و ئینجا وتی:
- لەمـــاوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا ئەمین کرا بەسەرباز..لەســـاڵی ١٩١٥دا شەهید کرا، بەپێی نوسراوی ژمارە (٣٣١/٨٠) بەشی تەجنید لە تۆماری مەدەنی سڕایەوە.
- باوکم نێوچەوانی دابەیەکا و تووڕەبوو قیراندی بەسەر فەرمانبەرەکە.
- جارێکی تر ئەو شتانە بخوێنەوە، کە لە لاپەڕەکەمدا نووسراون. دەڵێی من لەساڵی١٩١١ دا ژنم هێناوە؟
- بەڵێ ڕاستە،لێرەش هەروا نوسراوە، لە ساڵی ١٩١١دا زەماوەندت کردووە.
- ئایا تێبینیی هەڵەکان ناکەی لێرە جەنابی فەرمانبەر؟
گەر کوڕەکەم لەڕۆژی ژنهێنانەکەم لەدایك بووبێ، لەســـاڵی ١٩١٥دا تەمەنی تەنها چوار ســـاڵان دەبێ، کەی ئەم منداڵە چوو بۆ جەنگ؟ کەی شەهید بوو؟
نیشانەی پەشۆکاوی لە ڕووی فەرمانبەرەکە دەرکەوت، جارێکی تریش بەوردبینییەوە ڕوانییە تۆمارەکە ئینجا بێ ئەوەی تەماشـــای باوکم بکا ڕووی لەمن کردو وتی:
- بەتۆمارەکەتدا دەردەکەوێ ئەمینی کوڕت لەســـاڵی ١٨٩٦ دا لەدایك بووە. کەواتە لەســـاڵی ١٩١٥ دا شەهید کراوە. ئەو کاتە تەمەنی نۆزدە ساڵان بووە.
باوکم بەسەرسووڕمانەوە هاواری کرد:

- دەڵێی کوڕەکەم لەساڵی ١٨٩٦دا لەدایك بووە؟ لەسەرە خۆت کابرا، دەباشە دەبێ من کەی لەدایك بووبێتم؟
فەرمانبەرەکە جارێکی تر سەیری تۆمارەکەی کرد و بەدەنگێکی کزەوە وتی:
- تۆ لەساڵی ١٨٩٧دا لەدایك بویتە.
- ئەمە چییە جەنابی فەرمانبەر؟مەبەستت ئەوەیە من ساڵێك لە کوڕەکەم بچووکترم؟
لە ژاوەژاوی باوکم فەرمانبەرەکانی تریش لەدەوری تۆمارەکە کۆبوونەوە، لاپەڕەکانیان هەڵدەدایەوە و لەنێوان خۆیاندا کەوتنە مقۆمقۆ، بەڵام کەسیان نەیانتوانی وەڵام بدەنەوە.
لەپاش بیرکردنەوەیەکی قووڵ فەرمانبەری بەرپرسی تۆمارەکە وتی:
- لەوە زیاترم نییە کە لە تۆمارەکەدا نووسراوە.
باوکم ڕووی لە فەرمانبەرەکان کرد و بەگاڵتەجاڕییەوە لێیانی پرسی:
- بەڕێزان...کەسێك هەیە لەنێوانتان لە باوکی خۆی بەتەمەن تر بێت؟
فەرمانبەرەکە تووڕەبوو بەسەر باوکمدا نەڕاندی:
- لێت قبوڵ ناکەم گاڵتە بەتۆمارەکانی میری بکەیت، بەکورتی، ئێمە بڕوانامەی لەدایك بوون بۆ مردو دەرناکەین.
ئیدی بیبڕەوە و خوات لەگەڵ.
باوکم بردمی بۆلای بەڕێوەبەری فەرمانگەکە، هەموو ئەو قسانەی بۆ گێڕاوە، کە لە فەرمانبەری تۆمارەکە گوێمان لێبوو، بەڕێوەبەر وای دەرخست، کە گرنگی بە کێشەکەمان دەدات، ڕۆژنامەکەی بەردەسی لێکنا و داوای لێکردین لەگەڵی بڕۆین بۆ ژووری تۆمارەکان بۆ ئەوەی خۆی لە ڕاستی مەسەلەکە بگات.

بەڕێوەبـــەر چەند جارێك لاپەڕەكەی ئێمـــەی لەنێو تۆمارەكە خوێندەوە، دوایی وەك ئەوەی لەبەر خۆیەوە قسە بكات وتی:
- لەتۆمارەكەدا هاتووە كە ئەمینی كوڕت لەساڵی ١٩١٥ دا شەهید بووە.
دەنگی كزبۆوە و نیشانەی بیركردنەوە و شێلگیری لە ڕوخساری دەركەوت، دواتر سەرێكی باداو ڕووی لە باوكم كرد و وتی:
- مەســـەلەكە ڕوونە، تۆ بێوەژنێكت خواستووە، كوڕێكی لەمێردەكەی پێشووی بووە بەناوی ئەمین، ئەمینیش كوڕی مێردی ژنەكەتە، لەبەر ئەوەی باوكی مردووە، ئیتر تۆمارەكەش وا دەری دەخات، كە تۆ باوكیت، ئەمەش وا ڕاڤە دەكرێت كە لە تۆ بەتەمەن ترە.
خۆم پێڕانەگیرا، دەســـتم بەگریان وفیغان كردەوە، ئەمەش وای لە باوكم كرد تاكو هاوار بكاتە سەرما و بڵێ:
- لاڵ بە هەتیو، پێت وایە تۆمارەكە لەمن زیاتر دەزانێ تۆ كوڕی كێی؟
فەرمانبەرەكە خۆی گێڤەوە كردو بەخۆبردنە پێشەوە لە بەڕێوەبەر وتی:
- قسەكەت ڕاستە گەورەم.
باوكم نەخوێندەوار بوو، وەلێ لەو كەســـانە نەبوو بەرامبەر فەرمانبەری میری لاوازبێت.
بەرقەوە هاواری كردە سەر فەرمانبەرەكە و پێی گوت:
- خوێندنەوەی تۆمارەكەم بۆ تەواو كە.
فەرمانبەرەكە ڕووانییە تۆمارەكە و سەری ڕەزامەندی بۆ لەقاندەوە:
- هاجەر كچی بەكرە.. لەساڵی دا١٩٠٤ لەدایك بووە.
باوكم بەتەوسەوە بەرسڤی دایەوە:
- تۆمارو دەفتەرەكانتان جێی سەرســـووڕمانن، ژنەكەم لەساڵی ١٩٠٤دا لەدایك بووە، كەچی ئەمینی كوڕی لەســـاڵی ١٨٩٦دا لەدایك بووە!ئایا

ژنەفتووتانە کەسێك هەشت ساڵ پێش دایکی خۆی لەدایك بووبێت؟
جارێکـــی تر بەڕێوەبـــەرو فەرمانبەرەکە ئاوڕیان لـــە تۆمارەکە دایەوە، بەبێدەنگی دەیان خوێندەوە و بیریان دەکردەوە.
لەئاکامدا ســـەری بەرز کردەوە و ڕاست ڕاوەستا، وەك ئەوەی خۆی بۆ وتار خوێندنەوە لەبەرامبەر جەماوەرێکی زۆر ئامادەکردبێ، بە بزەیەکی ساردەوە وتی:
- هیچ ئاڵۆزیەك لەئارادا نییە، مەســـەلەکە زۆر ئاسانە و لۆتانی ڕوون دەکەمەوە: مێردی هاجەر کوڕێکی لە ژنێکی تری پێش هاجەر هەبووە، کە ژنی یەکەمی دەمرێ هاجەر دەخوازێ کە هەشت ساڵ لە کوڕەکەی بچووکتر دەبێ.
کاتێك ئەم پیاوەش دەمرێ، هاجەر شـــوو بەڕەشید دەکات، کە لە کوڕی پیاوەکەی ساڵێك بچووکترە.
ئەمەش بەتەواوەتی ڕوون بوەوە، بەتۆمارەکەدا دەرکەوتووە ئەمین هەشت ساڵ گەورەترە لە باوەژنەکەی و ساڵێکیش گەورەترە لە مێردی باوەژنەکەی.
فەرمانبەرەکان کەوتنە ماستاوچێتی و چەپڵەڕێزان و هاوارکردن:
- ئای چەنـــد مەزنی جەنابی بەڕێوەبەر، مەزنییەکەت لەوەدایە هەموو شتێك دەزانی !
بەڵام باوکم بەدەنگێکی ڕکاویەوە نوتقی لێیان بڕی و پێیانی گوت:
- جەماعەت ئێوە چی دەڵێن؟ مەبەســـتتان ئەوەیە من هاجەرم خواست حەوت ساڵان بووە و پێش منیش شوویەکی تری کردووە؟
- بەڕێوەبەر حەوسەڵەی لێ هەڵگیرابوو، بۆیە بەرسڤیی باوکمی دایەوەو گوتی:
- چاکـــە گەر ڕوون کردنەوەکەی منت بەدڵ نییە. فەرمووتۆ بۆمانی

ڕوون کەرەوە با ببینین....
فرمێسك لەچاومدا بەخوڕ باری، باوکم بەزەیی بەحاڵمدا هاتەوە و وتی:
-مەگری کــوڕی خۆم چیمانداوە لە قوتابخانــەی میری، دەتبەم بۆ حوجرەی مەلا داود،تاکو چیتر گوێمان لەم قسە پڕوپووچانە نەبێت..
عەیامێك بەســەر ئەم حیکایەتەدا تێپەڕی تا بۆ خزمەتی ســەربازی بانگهێشت کرام.
باشە چۆن بتوانم قەناعەتیان پێ بهێنم کە من پێشتر خزمەتی سەربازیم کردووە و ئەرکی سەر شانم بەجێ هێناوە، تەنانەت شەهیدیش کراوم؟
مردووان عەسکەری ناکەن.. پۆلیس بەباڵبەست کراوی بردمیان بۆ تەجنید بەتاوانی ئەوەی گوایە لە جێبەجێ کردنی ئەرکی نیشتیمانی هەڵاتووم.
باوکم گەیشــت پێم، تاکو ڕاستی مەسەلەکەی من بۆ ئەفسەرەکە ڕوون بکاتەوە:
-جەنابی قۆمیســەر، کوڕەکەم لەفەرمانگەی باری شارستانی بەمردو تۆمار کراوە!
ئەم کوڕەم شەهیدەو یەکێکە لە شەهیدەکانی جەنگی ڕزگاری.
گەر زیندوو بوایە دەفتەر نفوسیان بۆ دەردەهێنا!
ئەفسەرەکە وای زانی باوکم پێی ڕادەبوێرێ بۆیە قیڕاندی بەسەریا:
- چۆن زات دەکەی ئینکاری بوونی ئەم گەنجە بکەی، کە لە بەردەمما وەستاوە؟
دورکەوە لێرە، ئەگینا تۆمەتی فێڵ کردن لەیاسات دەدەمە پاڵ.
ئینجا ئاوڕی لە پۆلیسەکە دایەوە و پێی گوت:
- ئەم لاوە ببە بۆ سەربازگە!
کەیفــم هاتێ وغەرقی شــادیەکی قووڵ بوم و هەســتم کرد، کە خۆم

بینیوەتەوە لەنێو تاکەکانی سەربازگەکە.
کەواتە من وەکو ئەوان زیندووم وەك ئەوەی بەڕێوەبەری فەرمانگەی باری شارستانی دەیگوت، من نەمردووم.
ماوەی خزمەتی سەربازیم تەواو بوو.
هەموو سەربازەکان تەسریح بوون.
تەنها من نەبێ، هیچ ڕێگـــە چارەیەك نەبوو بۆ دەرکردنی بڕوانامەی دەرچوونم بەبێ دەفتەر نفوس.
یەکەی ســـەربازیەکەم نووسراوێکیان کرد بۆ بەشـــی تەجنید و داوای تۆمارەکەمیان کرد، لەپاش مانگێك ئەم وەڵامە هاتەوە:
(ئەو کەســـەی ناوی هاتووە لە نوسراوەکەتان، لەکاتی جێبەجێ کردنی ئەرکێکی نیشتیمانی لە ئۆپەراســـیۆنی (دەرسیم ) لەساڵی ١٩٣٨ دا مردووە).
بە فەرماندەکەمانم وت:
-ئەم زانیاریانە هەڵەن، من لە دەرسیم نەمردووم، بەڵکو لە (چەناقەڵا)و لەپێناوی بەرگری لەخاکی نیشتیمان شەهید بووم، دەتوانن لە فەرمانگەی باری شارستانی شارۆچکەکەمان داوای ڕونکردنەوە بکەن.
جارێکی تـــر لەنێوان فەرمانگە پێوەندیدارەکاندا دەس بەنامەو نوســـراو گۆڕینەوە کرا، چەندمانگێکی خایاند، منیش لە سەربازگە هەر چاوەڕوان بووم،تاکو گەیشتنە دوا بڕیار بەوەی کە: (من مردووم)!
ئەفسەرەکە ســـەری لەمەسەلەکەی من سووڕما، کاتێکیش لە نامە و نووسراوەکان هیچ دەرئەنجامێکی چنگ نەکەوت، بڕیاری دا نووسراوێکم بە واژووی خۆی بداتێ کە من خزمەتی سەربازیم تەواو کردووە، لەپاش چاوەڕوانییەکی زۆر تەسریح کرام.

گەڕامەوە شـــارۆچکەکەمان بینیم باوکم ئەمری خوای کردووە، دوایش بۆم دەرکەوت قەرزارە بەبانکی کشتوکاڵی میری، بەبڕی ١٥ هەزار لیرە، ســـەرباری هەزار لیرەش بەباجی دەرامەت، منیش تاکە میراتگری ئەوم پێویستە لەسەرم قەرزەکانی بدەمەوە.

باجی دەرامەت لێم نەگەڕاو لەڕێگای پیاوانی ئاسایشەوە منیان دەسگیر کرد، زۆرم هەوڵ دا تێیان بگەیەنم کە من مردووم، دەتوانن لەدروســـتی قسەکانم دڵنیابن و لە تەجنید و فەرمانگەی باری شارستانی بکۆڵنەوە:

- کوڕی ڕەشید نیت؟ ئینکاری دەکەیت؟

حاشا..چۆن ئینکاری باوکم دەکەم؟ بەڵام مردووم، شەهیدم.

وەلیَ بێسوود بوو...ســـووربوون لەسەر ئەوەی قەرزەکانی باوکم بدەمەوە، بەنابەدڵـــی قایل بووم، نابێت واز لە میراتـــی باوکم بهێنم تا قەرزەکان نەدەمەوە، ڕەحمەتی بێســـتان وزەوی و ئاقاری هەبوو، بەملیۆنەها لیرە دەخەملێنرا...هاوڕێکانی ڕەحمەتی پشتگیریان کردم و قەرزەکانم دایەوە، ئاسوودەبووم بەوەی قەرزی باجی دەرامەتی دەدەمەوە، هەستم کرد بەوەی کە من زیندووم.

وەلیَ ئەم هەســـتە زۆری نەخایاند، هەروەکو جاران بەبیَ دەفتەر نفوس هیچ ئامرازێکم بەدەستەوە نەبوو بیسەلمێنیَ کە من کوڕی باوکمم، ئایا مردوو دەبێتە میراتگر؟

ئامرازەکانم نیشاندەن تاکو منیش هەوڵدەم و بیسەلمێنم من زیندووم. ئەریَ من نابینن وا لەبەرامبەرتان وەستاوم؟

وەکو هەموو زیندوویەك خزمەتی سەربازیم تەواو کردووە، باجی دەرامەشتم داوە وەکو هەر هاووڵاتیەکی ئاسایی، وەکو هەموو کەسێك قەرزی باوکم لەبانکی کشـــتوکاڵی میری دایەوە، بەڵام ژیان بۆ ئەوکەسە نییە هاوار

بکات.
هەمیشە هەمان بەرسڤ دەدرێتەوە:
تۆ بەپێی نووسراو و تۆمارە میرییەکان مردووی!
ئامۆژگارییان کردم پەنا بۆ دادگا بەرم، پێویسـتە بیسـەلمێنم کە من زیندووم،لەگەڵ پارێزەرێك رێککەوتین کێشەکەم بگرێتە ئەستۆ، دانیشتن لەدوای دانیشـتن، لەماوەی دووساڵدا، پارێزەری میری لە گەنجینەی وڵات هەموو بەڵگەنامە و نووسراوە فەرمیەکانی هێنانە پێش، هێندەی نەمابوو منیش بڕوا بکەم بەڕاستی مردووم، بڕیار دەرچوو کە من مردووم، میریش دەست بەسەر هەموو میراتەکەی باوکمدا دەگرێت، نوقمی قەرز بووم، من ناتوانم هیچ شـتێ ئەنجام بدەم گەر نەیسەلمێنم لە ژیاندام، هۆشم لەلای خۆم نەما، بەهات وهاوارو قسەی ئاجڕوباجڕ کەوتمە سەر شەقامەکان، تاکو خۆم لەیەکێك لە بەندیخانەکان بینییەوە:
- چۆن بەندم دەکەن و من مردووم؟ ئایا مردوو بەند دەکرێت؟
کەوتنە تێهەڵدانم و هاواریان دەکرد ودەیانگوت:
- قوڕت بەسەر، ئەی لەکەیەوە مردو قسان دەکات؟
هەرچییەکم بەسەر هات، شـادمان بووم بەوەی گیرام و زیندانی کرام، دەزانی بۆ هاوڕێ گیان؟ ئەمە بەڵگەیەك بوو لەسەر ئەوەی کە من لە ژیاندام، پاش ماوەیەك ئازادکرام، لەپاش ئەوە تووشی کێشەو فشارێکی زۆر هاتم: بەبڕیاری دادگا میراتەکەم لەدەس چوو.
ئەوانەی کە قەرزیان دابوو پێم داوایان دەکردەوە، دەرگاکانی کار و پیشـە بەڕوومـدا داخران، بڕیارم دا بەنهێنی شـارۆچکەکەمان جێبهێڵم، ڕووم کردە (ئەستەمبووڵ ) دەبوو ئامرازێك بدۆزمەوە بۆ بژێوی ژیانم، لەوێ ناسـیاویم لەگەڵ کچێکدا پەیدا کرد،حەزمان لێ بوو زەماوەند بکەین،

بەڵام بەچی شێوەیەك زەماوەند بکەین؟
هاوسەرگیریش پێویستی بەدەفتەر نفوس هەیە؟ لە ئاکامدا بەبێ بەڵگەنامەی فەرمی خێزانمان پێك هێنا.
بەو برە پارەیەی پاشەکەوتم کردبوو، دووکانێکی بازرگانیی بچووکم دانا، بەناوی یەکێکی ترەوە تۆمارم کرد، چونکە من بەفەرمی مردووم وبۆم نییە ببمە خاوەنی دوکانێکی تایبەت بەخۆم! ساڵێك بەسەر ئەم حاڵەدا تێپەڕی لە ناکاو ئاشکرابوو ئەوەی دوکانەکەم بەناویەوە تۆمار کردبوو هەموو شتێکی بردووە و خۆی وون کردووە.
دوکانەکەم نەماو هەموو شتێکم لەدەست چوو، وەلێ بۆ باج دان، دەبێ من بیدەم بەپێی ئەو بۆندەی کەواژووم لەسەری کردووە لەنێوان من و ئەو پیاوە، کەواتە بێ سوودە لەکاتی باج داندا ئیدعای مردنم بکەم.
کەس گوێم بۆ شل ناکات وکەسیش باوەڕ بەوە ناکات کەدەیلێم!
هەموو دەرگاکان بەڕووما داخران و دنیام لەبەرچاو تەنگ بوو، هیچ ئامرازێك لەبەردەممدا نەما بۆ بژێوی خێزانەکەم، غەیری دزی کردن نەبێت!
ئەم حاڵەتەش زۆری نەبرد، دەسگیر کرام، حیکایەتی مردوو بوونەکەشم هیچ سوودێکی نەبوو لەگەڵیان،مردووان دزی ناکەن!
کەچوومە زیندانەوە تروسکاییەك ئومێد لەلام پەیدا بوو.
کەواتە من زیندووم...بەڵام ئای لەجیاوازییەکانی قەدەر!کاتێك ئارەزووم لە چوونە قوتابخانە هەیە، هەموویان لە ڕێگام دەبنە لەمپەر و بەربەست بەبیانووی ئەوەی مردووم! اکاتێکیش بانگێشتی سەربازی دەکرێم هەموو دەیسەلمێنن کە من زیندووم!کە داوای مافی شەرعی خۆم دەکەم لەمیراتەکەی باوکم، هەموو لەدژی من رادەوەستن، تەنانەت دادگاش!کە

دەخرێمـــە بەندیخانەوە من زیندووم! کاتێ ژنم هێنا من مردووم!ئائەمەیە کێشـــەکەی من هاورێ گیان، بەڵام بەبەراورد کردن لەگەڵ ئاریشەی منداڵەکانم شـــایانی گوێ نەدانە، من ڕۆژێ لەڕۆژان لەتۆمارەکانی میری زینـــدوو بووم ودەژیام،دواتر شـــەهید بووم، ئـــەدی چ بەچوار منداڵەکەم دەڵێی !ئێســـتا ئەوان نەلە ڕیزی مردووان دەژمێردرێن و نە لە ڕیزی زیندووان.

هەر چواریـــان بەفەرمی لەدایك نەبوونە، مـــادام باوکیان مردووە، ئەو منداڵانـــەش هەرگیز لەدایك نابن...ئێی ی ی..لەپاش ســـێ ڕۆژی تـــرو کاتێك مـــاوەی زیندانییەکەم تەواو دەبێـــت، جارێکی تر دەچمەوە خانەی مردووان!کاتێ ئەو پشوودانەی درابوو پێمان تەواو بوو،پاسەوانی بەندیخانەکە فیتۆی لێدا و داوای لێکردین بچینەوە نێو قاوشی زیندانەکە. هاورێکەم لەپاش گوێگرتنی لەبەسەرهاتەکەی من ئاخێکی هەڵکێشا و وتی:

- ئێی ی ی ی. دەبێت چی لەتواناماندا بێت پێشکەشـــی بکەین گەر بژین یاخود بمرین؟ گرینگ ئەوەیە ناوی وڵاتمان بەرز ببێتەوە.

هەر کە لە تەلبەندی بەندیخانەکە نزیك بووینەوە ڕەنگی سوور هەڵگەڕا و دەمارەکانی ملی ئاوســـا و هەردوو دەســـتی بەرز کردەوەو بەشێوەیەك دیوارەکانی بەندیخانەکەش سەدایان دەدایەوە، هاواری کرد:

بەرخورداربێت نیشتیمان! بەرخورداربێت نیشتیمان!

# مێزەکەی گەورە تر بکەن!!

- گەورەم، جەنابی بەڕێوەبەر
- من ئاگادارم عاسم ئەفەنی. من زۆر شادمانم بە کارەکەتان.
عاسم بەگ وشەی (گەورەم. بەگم)ی دووبارە کردەوە، بەڵام بەڕێوەبەر قسەکەی پێ بڕی و وتی:
- وا نەزانـــی من تۆم لەبیر کردووە، عاســـم ئەفەنی. زۆر سوپاســـت دەکەم و من ئاگادارم هەموو ئەرکەکانی نووسینگە کەوتۆتە سەرشانی تۆ و دەشـــزانم گەر بوونی تۆ نەبێت لـــەم فەرمانگەیە هەموو کار و چالاکییەکان دەوەستن.
دواتر بەڕێوەبەر پەنجەی نا بەزەنگەکەدا و فەڕاشەکە هات، پێی گوت:
- بە بەڕێوەبەری کارگێڕی بڵێ با لێرە ئامادە بێت.
ئینجا ئاوڕی لە عاسم ئەفەنی دایەوە و پێی گوت:
- بە چاوێکی پڕ بایەخەوە دەڕوانمە چالاکییەکانت، پاشان مێزەکەشتان دەگۆڕم..!
عاسم ئەفەنیش گوتی:

- خوا تەمەن درێژتان بکات گەورەم. بەگم.
پاشان جەنابی بەڕێوەبەر، بە بەڕێوەبەری کارگێڕیی وت:
- مێزێکی گەورەتر بکڕن بۆ عاسم ئەفەنی.
عاسم ئەفەنیش سوپاسی بەڕێوەبەری کرد و لە ژوورەکەی چووە دەرێ. ژمارەی فەرمانبەران لە نووسینگەکە هەشت ژن و بیست و حەوت پیاو بوون، لەگەڵ ئەو ژمارە زۆرەی فەرمانبەران و هەموو مانگێکیش مووچەکانیان وەردەگرت، کەچی بە هەموویانەوە ناتوانن هێندەی عاسم ئەفەنی کارەکانیان ڕاپەڕێنن، عاسم ئەفەنی و کارمەندان و سەرۆك بەشەکان و تاکو بەڕێوەبەریش ئاگاداری ئەم مەسەلەیەن. عاسم ئەفەنی چواردە ساڵە لەم نووسینگەیەدا کار دەکات، بۆ تەنها ڕۆژێکیش لە کارەکەی دانەبڕاوە، تەنانەت گەر نەخۆشیش کەوتبێت. سەرەڕای ئەوەی لە بەیانییەوە تاکو ئێوارێ بەبێ وچان کاری دەکرد، وەلێ هەندێ نووسراو و دۆسیەشی لەگەڵ خۆی دەبردەوە ماڵەوە، تاکو تەواویان بکات.
ماوەی کاتژمێرەکانی کارکردن بەشی نەدەکرد. جانتا شڕ و شۆڵەکەیشی پڕ بوو لە مەعامەلات، بە تایبەتی کە لە نووسینگەوە دەچووەوە بۆ ماڵ، یاخود لە ماڵەوە بۆ نووسینگە.
لە ڕاستیدا ناتوانین بڵێین فەرمانبەرەکانی دی دەوام ناکەن. لەو ماوانەی یاریی تۆپی پێ نەبێ، یان کارێکی گرنگیان نەبێ، یاخود لە کاتی پشوودانداا، یان نەخۆش نەبن، ئامادە بوونیان دەبێت لە نووسینگە و لەگەڵ یەکدا کاتی خۆش بەسەر دەبەن.. ڕاستە عاسم ئەفەنی چواردە ساڵە لەم نووسینگەیەدا کار دەکات، بەڵام یەك دانە قرووش لە مووچەکەی زیادی نەکردووە، هاوکات هەموو ئەو کارمەندانەی

لەگەڵــی کار دەکەن، لە نووســینگە و ئەوانــەی دوای ئەویش دەس بەکار بوون چەندین پلە و پایە بەرز بوونەوە. هەرچەندە عاســم ئەفەنی دڵنەرم و بەســۆزە، وەلێ مافی خۆی لە بیر نەکردووە و سوورە لەسەر ئــەوەی هەر هیچ نەبێت مانگی جارێك بچێت بۆ لای بەڕێوەبەر پێی بڵێ: "گــەورەم. بەگم". لێ بەڕێوەبەر بــواری ئاخافتنی نەدەدا، پێش ئەوەی زاری هەڵبێنێ پێی دەگوت:

- من ئاگام لە هەموو شــتێك هەیە عاسم ئەفەنی، من زۆر شانازی بەکارکردنتانــەوە دەکەم، وا تێنەگەی من بــە چاوێکی بێ بایەخ و گرنگی نەدانەوە دەڕوانمە تۆ.

دواتر دەنێرێ بە دوای بەڕێوەبەری کارگێڕی و پێی دەڵێ:

- مێزێکی گەورەتر بکڕن بۆ عاسم ئەفەنی..!

عاسم ئەفەنیش دەڵێ:

- خوا تەمەن درێژتان بکات گەورەم. بەگم و بەسەر دانەواندن و ڕێزگرتن لە جەنابی بەڕێوەبەر لە ژوورەکەی دەچێتە دەرەوە.

ڕۆژێکیان بەڕێوەبەر دەچێتە ژوورەکەی عاسم ئەفەنی و بەسەرسووڕمانەوە دەپرسێت:

- ئا ئەمە ئەو مێزەیە، کە ئێوە لەسەری کار دەکەن؟!

- بەڵێ.

قەبارەی (٨٠سم × ٤٠سم)ە، بەڕێوەبەر بانگی کرد و وتی:

- شــتی وا چۆن دەبێــت.. دەبێ بە زوترین کات ئــەم مێزە گەورەتر بکرێتــەوە. دەبێ درێژییەکەی لە دوو مەتــر کەمتر نەبێت.. ڕۆژێك بەڕێوەبەر هاتە ژوورەکە و وتی:

- پێویستە مێزەکەی عاسم ئەفەنی ڕەونەقدار بکەن.. دوایش بڕیارێکی

بۆ ئەو مەبەستە دەرکرد..
هەرجارێکیش بهاتایە ئەم ژوورە بڕیارێکی دەردەکرد، بە گۆڕانکارییەك لە مێزەکەی عاسم ئەفەنی...
- ئای. ئای.. بۆچی شووشە لەسەر مێزەکەت نییە عاسم ئەفەنی ؟..
خێرا شووشەی لەسەر دانێن، لە فەرمانگەکە لە مێزەکەی عاسم ئەفەنی گەورەتر و تریسکەدارتر نەبوو، وەلێ هیچ مووچەیەکیش لە مووچەی عاسم ئەفەنی کەمتر نەبوو...تەنانەت مێزەکەی بەڕێوەبەریش لە مێزی ماڵەباجێنەی منالان دەچوو، لە چاو مێزەکەی عاسم ئەفەنی..
لە بەرامبەر چاکە و هەڵوێستە باشەکانی بەڕێوەبەر عاسم ئەفەنی نەیدەزانی چی بڵێ. وەلێ لە ناخەوە خۆی دەخواردەوە. دڵخۆشیش بوو بەوەی هەفتە لە دوای هەفتە مێزەکەی گەورەتر دەکرا.
درێژیی مێزەکەی عاسم بەگ بوو بە سێ مەتر و پانییەکەیشی بوو بە مەتر و نیوێك. مێزێکی زەبەلاحی لێ دەرچوو.
ڕۆژێکیان عاسم ئەفەنی بەدەست کەم دەرامەتییەوە دەینالاند و خەریك بوو ڕۆحی بگاتە کونا لوتی، چوو بۆ ژووری بەڕێوەبەر و بەبێ ڕوخسەت وەرگرتن کەوتە ئاخاوتن و وتی:
- گەورەم بەڕێوە....
- بەە.. بەە.. عاسم ئەفەنی. من زۆر شادمانم بە کارەکەت، ئەرکێکی زۆرت لەسەرە و بە حەوسەڵەیت..
دواتر پەنجەی نا بە زەنگەکەوە و داوای بەڕێوەبەری کارگێڕی کرد و پێی گوت:
- بۆچی مێزەکەی عاسم ئەفەنی گەورەتر ناکەنەوە..؟
بەڕێوەبەری کارگێڕی وەڵامی دایەوە:

- لە ژوورەکەدا جێگای فەرمانبەرەکانی تر نەماوە گەورەم.
- لەم حاڵەتەدا دەبــێ فەرمانبەرەکانی بگوازرێنەوە بۆ ژوورێکی تر.
درێژی مێزەکەی عاسم ئەفەنی بوو بە چوار مەتر و پانییەکەیشی بوو بە دوو مەتر. لەسەر مێزە زەبەلاحەکەی و لە ژوورەکەی خۆی بە تەنیا دەس بەکار بوو.
عاسم ئەفەنی دڵخۆش بوو بەوەی بەتەنیا و لەسەر مێزە زەبەلاحەکەی کار دەکات، بەڵام ئەم کەیف و خۆشییەی لە دوو مانگ پتری نەخایاند.. دوای ئەوە لەپڕ ڕۆیشت بۆلای بەڕێوەبەر و کەوتە قسەکردن و وتی:
- گەورەم.. بەڕێوەبەر..
گرژی و تووڕە بوون لەســەر و سیمای بەدی دەکرا، وەلێ پێش ئەوەی لە قسەکانی ببێتەوە، بەڕێوەبەر پێی گوت:
- دڵنیابە عاســم ئەفەنی، ئێمە هەموو کاتێك ڕێزمان لە کارمەندی دڵسۆز گرتووە، وا تێنەگەی لەبیرمان کردوون.
دواتر پەنجەی نا بە زەنگەکەوە و ناردی بەدوای بەڕێوەبەری کارگێڕی و پرسیاری لێکرد:
- مێزەکەی عاسم ئەفەنیتان ڕەونەقدار کرد؟
- بەڵێ گەورەم، ئێمە هەموو مانگێك هەڵدەسین بە ڕەونەقدارکردنەوەی..
- ئەی شووشەتان لەبانی دانا؟
- بێگومان گەورەم.
- کەواتە لەسەرتانە گەورەتری بکەنەوە..!
عاســم ئەفەنی دەستی برد بۆ نووسراوی دەس کێشانەوەکەی لە کار و خستیە گیرفانییەوە و بە بەڕێوەبەری وت:
- خوا تەمەن درێژتان بکات گەورەم، ئینجا چووە دەرەوە..

لە پاش ئەوەی مێزەکەی عاسم ئەفەنی جارێکی تریش گەورەتر کرایەوە، بەڕێوەبەری کارگێڕی چوو بۆ لای جەنابی بەڕێوەبەر و پێی وت:
- ئیدی لە تواماندا نەماوە لەوە زیاتر مێزەکەی عاسم ئەفەنی گەورەتر بکەینەوە.
- بۆ؟!
- لەبەر ئەوەی قەوارەی مێزەکە تەواوی ژوورەکەی گرتۆتەوە، شوێنێك نەماوە، تاکو عاسم ئەفەنی لەسەری دابنیشێ و ئێستا لە بەردەم دەرگای ژوورەکە دانیشتووە.
بەڕێوەبەر وتی:
- کەواتە دیواری نێوان هەر دوو ژوورەکە بڕووخێنن و مێزەکەی عاسم ئەفەنی گەورەتر بکەنەوە...
مێزەکەی عاسم ئەفەنی بەقەدەر مێزی ئەو ژەنەڕاڵانەیان لێهات، کە نەخشەی لەسەر دادەنێن و پلانی جەنگی لەسەر شرۆڤە دەکەن.
عاسم ئەفەنی لە خۆشیانا خەریك بوو باڵ بگرێت. وەلێ ئەم خۆشییە لە دوو مانگ پتری نەخایاند، چونکە کرێی خانووی نەداوە. هەروەها کارەباشیان لێ بڕی. سەرباری ئەوەی ئەم بەیانییە ژنەکەی داوای پارەی لێ کردووە. عاسم بەگ بەرەو فەرمانگە کەوتە ڕێ و لە ڕێگا لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد و بڕیاریدا لەگەڵ بەڕێوەبەردا بەشەڕ بێت. مەسەلەکە گەیشتە کەپووی و ئەمجارەش بێدەنگ نابێت و هەر وشەیەك بێتە سەر زاری نایگێڕێتەوە. یا ئەوەتا مووچەکەی زیاد دەکات، یاخۆ دەس لە کار دەکێشێتەوە. بەبێ ئیزن وەرگرتن چووە ژووری بەڕێوەبەر. بەڕێوەبەری نەبینی لە بەردەم دەرگا وەستا و چاوەنواڕی کرد، تاکو بەڕێوەبەر هات و ئینجا کەوتە قسەکردن.

- گەورەم و بەگم.
بەڕێوەبەر نەیدەویست بواری بدات وشەی (گەورەم و بەگم) تەواو بکات، وەلــێ لەبەر ئەوەی بە پاڵتۆ داکەندنـــەوە خەریك بوو ئیدی نەیتوانی قسەکانی پێ ببڕێت..
- من زۆر کەیف خۆشم بە کارەکەت عاسم ئەفەنی.
- ئەی گەورەم و بەگم. ئەز چواردە ساڵە لەم نووسینگەیەدا فەرمانبەرم.
- چالاکییەکانت!
- بەڵام تاکو نهۆ هیچ زیادەیەکم لە مووچەکەم وەرنەگرتووە.
- مێزەکەتان..!
- من مێزم ناوێت، هەموو مووچەیان زیاد بووە. تەنها مووچەکەی من نەبێ...
ئەمجارەیان بەڕێوەبەر گوێگر بوو، نەك ئەو، عاسم ئەفەنی ویستی ئەو هەگبە تووڕەییەی، کە چواردە ساڵە باری کردووە بەتاڵ کاتەوە، چاوی نوقاند و دەمی کردەوە و لە پاش ئەوەی لە قسەکانی بووەوە، بەڕێوەبەر هاوارێکی کردە سەریا و پێی وت:
- تــۆ ســفلەی. مێزەکەت بەقـــەدەر ژوورەکەمە، لـــەم فەرمانگەیە فەرمانبەرێکـــی تر نییە مێزەکەی بەقەدەر ئەوەی تۆ بێت. تۆ شـــەرم لە قســـەکانت ناکەیت. تۆ ویژدانت نییـــە. چی ترت دەوێ لە پێناوتا بیکەم لـــەوەی زیاتر، کە کردوومە بۆت؟ هەمـــوو مانگێك مێزەکەتم گەورەتـــر کردووەتەوە. هەرچەند ئەز بەڕێوەبـــەری ئەم فەرمانگەیەم، کەچی مێزەکەت لە مێزەکەی مـــن گەورەترە. تەلارەکەمان بە تۆبزی بەشی مێزەکەی تۆ دەکات. یاڵڵا بچۆ دەرەوە. من هیچ چارەسەرێکی ترم نییە. گەر بە دڵیشـــت نییە دەتوانی دەس لە کارەکەت هەڵگری.

عاسم ئەفەنی لە ژووری بەڕێوەبەر چوو دەرەوە، بەبێ ئەوەی وشەیەك بدرکێنێ. تەماشایەکی مێزە زەبەلاحەکەی کرد. بە ڕاستی زۆر جوانە. تاکو لە ژووری نووستنەکەیشی مەزنترە. نا. نەخێر لە هیچ جێگایەکی تر ئەم ڕێزەی لێ ناگیرێت. لەسەر مێزەکەی دانیشت و دەس بە کار بووەوە، بەڵام چیدی مێزەکەی عاسم ئەفەنی لەوە زیاتر گەورەتر نەکرایەوە.

# برازای
# پیاوە ناودارەکە

ئێمـــە کارمەندێلێکی دێرینین. لەم فەرمانگەیەی کاری تێدا دەکەین، هەموو وەکو برا دەژین، چەندین ساڵە یەکدی دەناسین. ڕۆژێ لە ڕۆژان لە نێوانمان وتە وت و قرەوبڕەیەك ڕووی نەداوە. هەموو یەکترمان خۆش دەوێ و ڕێز لە یەکدی دەگرین، وەك ئەوەی خزمی نزیکی یەکتر بین. لە کاتێکدا سەرقاڵی بەسەربردنی ژیانێکی پڕ لە ئاسودەیی و برایەتیی ڕاســـتەقینە بووین، ڕۆژێکیان بەڕێوەبەر بە یاوەری کوڕە لاوێك هاتە بەشەکەمانەوە... ئەوەی ڕاستی بێت گەنجەکە ڕوخساری لە ئەکتەرەکان دەچـــوو. قژی خاوبوو بەهۆی بەکارهێنانی ڕۆنی ســـەر دەبریقایەوە، مرۆڤ کە دەیڕوانییە پەرچەمەکەی هەستی بە کوێری دیدەی دەکرد لەبەر تیژی تریسکەدانەوەی، بەڕێوەبەرەکەمان تا سنوورێك بەڕێز بوو. هەندێکیش خۆشەویست بوو. کە هاتە بەشەکەمانەوە دەستی نابووە سەر شانی گەنجەکەوە..

ڕاستەپێ لە شوێنی خۆم هەستام..

هاوکارانیشم بەهەمان شێوەی من لە شوێنی خۆیان هەستان. بەڕێوەبەرمان

پیاوێکی چاکە و لەهەمان کاتیشدا پیاوێکی دڵڕەقە. پێناکەنیٚ و ڕوومان نەداتــــیٚ، عادەتیش نەبوو بێت بۆ ژوورەکەمــــان. هەڵبەتە لە مەرامی هاتنەکەی بۆ لامان لە پشــــتییەوە شتێکی گرنگ هەیە!... نیگای گەنجەکەم دەکرد. نەم توانی ڕوخساری بەراورد بکەم لەگەڵ کەسێکی تر. گەر بڵێم لە بەرپرسە گەورەکانە، نەخێر لەوان ناچێت، هەرچەندە لەم ڕۆژگارە کەسانی دەمڕوت دەبنە پشکێنەر، بەڵام لەوانەش نییە، باشە بەڕێوەبەر لەبەر چی واڕێزی لێدەگریٚ و شانی دەتەکێنیٚ؟! بەڕێوەبەر یەکەمجار لاوەکەی هێنا بۆ لای من و پێی ناســــاندم، دواتر بەوانەی تری ناساند!

- تەکین ئاغا.

لەپاش ئەوەی پێمانی ناساندن، بەڕێوەبەر وتی!

- تەکین ئاغا لە بەشەکەتاندا کاردەکات. لە پاش نەختێك بەڕێوەبەری ئیدارە ئاگادار دەکەم مێز و کورسی بۆ بنێریٚ.

بیٚ ئەوەی بیر لە قسەکەم بکەمەوەو بیکوڵێنم لە بەڕێوەبەرم پرسی:

- ئەو کارە چییە پێی دەسپێرین؟

ڕوخساری بەڕێوەبەر سوور داگەڕا و وتی!

- دوایی ئاگادارت دەکەمەوە.

ئاوڕی لە گەنجەکە دایەوە و ئاماژەی بۆ کورسیەکی خاڵی کرد:

- فەرموون ئێستا دانیشە بە شێوەیەکی کاتی.. کەلوپەلی نووسینگەکەت دەسبەجیٚ بۆ دەنێرم.

بەڕێوەبــــەر لە ژوورەکە وەدەرکەوت، هەموو بە تیلەی چاو تەماشــــای (تەکین) ناوەکەمان دەکرد، لەســــەر کورســــیەکە دانیشت و پێی خستە ســــەر پێی و شانی دادایە سەر مێزەکەی من، بە دوکەڵی جگەرەکەی

ژوورەکەی قانگ دا. پێم وت:
- بە خێربێیت ڕۆڵە.
هەموو هاوکارانی ترم بەخێرهاتنیان کرد، تاوێك بێ دەنگی باڵی بەسەر ژوورەکەیا کێشا... گەنجەکە پرسی:
- چ جۆرە کارێك دەکەن لێرە؟
- ئێمە...؟ ئێرە بەشی سێیە..؟ ئەو نووسراوانە رێك و پۆلین دەکەین کە بۆمان دێت. نازانم لە جۆر و شـــێوازی کارکردنمان تێگەیشت، یان نا. بەڵام ئەو وتی:
- کارێکی خراپە.
- چەنێ بەدرەوشتە؟!
- خراپە.. خراپ نییە.. ئەمە کارەکەمانە.. ئێمەش ناچارین جێ بەجێی بکەین..
پاش تۆزێك فەڕاشەکە هات و وتی:
- جەنابی بەڕێوەبەر داوات دەکات.
بە خێرایـــی و لە پاش ئەوەی جلوبەرگەکەم رێکخســـت، لە دەرگای بەڕێوەبەرم دا و چوومە ژوورەوە...
- ئەو کەسە دەناسی کە لەگەڵمدا بوو؟
- نەخێر گەورەم...
- هەی هاوارم.. هەی.. هیزە ئاگاداربن، برازای جەنابی (فیشەکەدین) ە...
- ئاوها؟!
دەمم بەداچەقاوی مایەوە....
سەر لەبەیانی جەنابی (فیشەکەدین) بە تەلەفۆن پێوەندی پێمەوە کرد

و وتی: (برازاکەم دەنێرم بۆ لاتان، کارێکی گونجاوی پێ بسپێرن)و لە پاش دوو دەمژمێر ئەم لاوە هات وتی: (مامم پێوەندی پێتەوە کرد سەبارەت بە من؟!) وتم: (بەڵی پێوەندی کرد).
بەڵام روخساری گەنجەکە و جموجوڵیم بەدڵ نەبوو، پرسیارم لێکرد: دەتەوێ چ جۆرە کارێك بکەی؟
وتی: ئەم بابەتە لەگەڵ مامم تاوتوێ بکە هەتیوە بە لەخۆبابییەوە دەئاخافت، من نازانم کوڕی کێیە. ونازانم چ جۆرە کارێك گونجاوە بۆی...! لەوانەیە تەمەنی خۆی لە بیست ساڵ بدات... پرسیارم لێکرد: خزمەتی سەربازیت کردووە؟. وتی: (بێگومان خزمەتی سەربازیم کردووە) لە بارەی فێربوون و خوێندنەوە پرسیارم لێکرد، وتی: (دەرچووی زانکۆم) پێم وت: بڕوانامەی زانکۆییەکەت لەگەڵ خۆت ئامادەبکە، هەروەها بڕوانامەی پابەندبوونی خزمەتی سەربازی و ناسنامەکەتیش بهێنە، تاکو کارێکی شایستەت پێ بسپێرین. لە پاش نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ هەموو ئەو شتانەی هێنا کە داوام لێکردبوو..
بەڕێوەبەر وتی: لە هەر بەشێکی تر دایبمەزرێنم هەندێ گرفتمان بۆ دروست دەبێت، چونکە کارمەندەکانی تر نازانن وەکو ئێوە ئاگاداریبن و بیحلمێنن، هەرچۆنێك بێت فەرمانبەرێکی دێرین و خاوەن ئەزموونێکی دوور و درێژی لەم بوارە.. تکات لێدەکەم بۆ ئەوەی لەقەزارو بەلا وەدووربین تا ماوەیەك گرنگیی پێبدە و چاودێر و سەپەرشتی بکە.
- لە سەر سەرو لە سەرچاو، بەڵام چ جۆرە کارێکی پێ بسپێرم؟
- بڕوانە خۆت مەسەلەکە چارەسەر بکە. چی دەدەنێ بیدەنێ. چاکتر وایە هیچ کارێکی پێ نەسپێری!
دووبارە گەڕامەوە بەشەکەم. چیم دی؟ مێزێکی مەزن، پارچە مینایەکی

جوان و گەورەی لە ســـەرە و کورسیەك بۆ تەکین ئاغا.. لە ژیانما لە سەر کورسی وا دانەنیشتووم، کە بۆ فەرمانبەرە تازەکە دانراوە تاکو لە سەری دانیشێ...!
چ کارێك بەم گەنجە بســـپێرم؟! زۆر تێفکرام و بیرم کردەوە، لە پاشان دۆســـێیەکم لە گەنجینەکە دەرهێناو دامە دەستیەوە بەو نیازەی ببێتە جۆرێك لە خۆشەویستی و گفتوگۆ لە نێوانمان!
- لوتفتـــان هەیە تەکین ئاغا... گەر هەوڵبدەن لەکاتی دەس بەتاڵیتان ناوەڕۆکی ئەم دۆسێیە دەربهێنن.. وتی:
- چی لە ناوی دەربهێنم؟
- ناوەڕۆك.
- دەڵێی ڕۆك!ئەم ڕۆکە چییە؟
سەری لێشێواندم، نیگایەکیم کرد. هەوڵم دا تێیبگەیەنم مانای ناوەڕۆك چییە، بەڵام ئەویش ملی خوراند وتی:
- چی لەم دۆسێیە دەکرێت؟
لە دڵی خۆمدا گوتم: گەر برازای جەنابی فیشەکەدین نەدەبووی وڵامم دەدایتەوە بەڵام... دوعا بۆ مامت بکە.
وتم:
- ئێمە پێویستیمان پێیەتی.
دۆسێکەی هەڵگرت و لەســـەر مێزەکەی داناو بە پەنجەکانی دەستی لۆی پەڕەکانی دەگرت و هەڵیانی دەدایەوە. لە پاش کەمێك وتی:
- من دەڕۆم.
هیچم پێی نەوت.. لە ژوورەکە چووە دەرەوە. بۆ ڕۆژی دوایی، کاتژمێر یانزە و نیو گەیشتە فەرمانگە، تاوێك دانیشت و لە پاشان بەیەکجاری

تێی تەقاند و ئەو ڕۆژە نووســـینگەکەی بەجێ هێشت.. لە پاش دوو ڕۆژی تر لە ناو ژوورەکە دەهات و دەچوو، دوایی بە فیکەلێدان چووە دەرێ..لەپاش نەختێك پرسیارم لە هاوکارم (سەفیە خان)کرد:
- تەکین ئاغا دەرچووی کوێیە؟
- کۆلێژی یاسا.
ئافرەتەکە لە شوێنی خۆی هەستاو کەمێك بیری کردەوە و وتی:
- شتێکتان پێ بڵێم؟ ئەم هەتیوە تەنانەت دەرچووی ئامادەییش نییە..!
لە ڕاستیدا هەمان هەستم هەبوو، نەیدەزانی بە چاکی بنووسێت..
سەفیە خان وتی:
- مـــن وای بۆ دەچم ئـــەم هەتیوە خزمی فیشـــەکەدینیش نەبێت، بەڕێوەبەرمانی هەڵخەڵەتاند! ئەم عەیامە لەم جۆرە فرت و فێڵانە زۆر ڕوودەدات، ئێوە ڕۆژنامەکان ناخوێننەوە؟ چووم بۆ لای بەڕێوەبەر، قسە و باسەکانی نێوانمان بۆی گێڕایەوە وتی:
- ئامان دەخیل. بێدەنگ بە منیش هەستم بەو شتە کردووە، لە ژیانما پیاوێکی ئاوها گەمژە و نەزانم نەبینیوە، کەواتە ئێمەی فریودا، گوایە برازای (فیشەکەدین)ە، ئای سەرم زۆر دێشێ.. چۆن بەمە بزانین؟
پێم وت:
- بڕوانامەکەیم بدەرێ تاکو خۆم بەدواداچوونی بۆ بکەم و لێی دڵنیابم.
(بەکالۆریـــۆس)ە کەیم لێ وەرگـــرت و دەس بەجێ چووم بۆ کۆلێژی یاسا. دەرکەوت بڕوانامەکەی ساختەیە.
بەڕێوەبەر وتی:
- توبی خودا باچەند ڕۆژێك چاوەڕێ بکەین.. گەر بەڕاستی برازای فیشەکەدین بێ ئەوە لە کێشمەکێشمەکانی ڕزگارمان نابێت.

لە پاش ماوەیەك، شتی سەیرو نامۆ ڕوویدەدا لە بەشەکەمان. لە کاتێکدا دەرزیلەیەك ون نەدەبوو لە ژوورەکەمان، کەچی ئێستا پارە و قەلەمەکانمان ون دەبـــن و دەدزرێن، ئەو ڕۆژەی تەکیـــن ئاغا بێت بۆ فەرمانگەکە شتێك دیار نامێنێت. ڕۆژێکیان پاڵتۆکەی کاك (مشتاق) لە جبەخانەکە دیارنەما، پاســـەوانەکەمان دەسگیرکرد و خستمانە بەرلوولەی تۆپەکە، وتی:

- مـــن دزەکە دەناســـم بـــەڵام ناتوانم بیهێنم لە بەر ئەوەی تووشـــی چەرمەسەری دەبم.

بەڵێنمان پێیدا و دڵنیامان کرد لای کەس نەیدرکێنین. ئینجا پاسەوانەکە کەوتە قسەکردن:

- تەکین ئاغا هەموو شتەکانتان دەدزێ.. چەند جارێ خۆم لێ مات کردووە. هەرئەو بوو دزی دەکرد، کڵاوە ئاســـنەکان دوابەدوای یەك ون دەبوون، تاکو ڕۆژێکیان ئامێری تایپەکەش تیاچوو.

ئینجا چووم بۆ لای بەڕێوەبەر و حیکایەتەکم بۆ گێڕایەوە و وتی:

لێم مەپرســـە، جارنەجـــارێ دێت بۆ ژوورەکـــەم.. هەرجارێکیش بێتە ژوورەکەمەوە هەندێ شتومەك لە نووسینگەکەم بزردەبن، بەر لە چەند ڕۆژێـــك چەرخەکەم دیار نەما.. گەڕامەوە ژوورەکەم و لە دڵی خۆمدا وتم:

گـــەر بزانین برازای جەنابی فیشـــەکەدین نییە، فاتیحامان لەســـەر دەخوێند...

ڕۆژێکیان کاك (مشتاق) وتی:

- تۆ بڵێیت ئەم کوڕە خزمەتی سەربازی کردبێت؟

- دەڵێ تەواوم کردووە و گوایە مولازمی یەکەمیش بووە.

- درۆ دەکات هیچ لەبارەی سەربازییەوە نازانێت.
بەپەلە خۆم گەیاندە بەڕێوەبەر لەو باس و خواسەی نێوانمانم ئاگادار کردەوە.
- منیش لەم لایەنەوە بە گومانم لێی، چۆن لە ڕاستیی ئەو مەسەلەیە بگەین؟
- بچین بۆ بەشی خزمەتی سەربازی (تەجنید) و لە ڕاستی مەسەلەکە بکۆڵینەوە.
دەرکەوت خزمەتی سەربازیەکەیشی ساختەو قەڵبە، بە بەڕێوەبەرم وت:
- دەبا ئەم کەسە ڕادەستی پۆلیس بکەین.
- دەیدەینە پۆلیس.. رادەستی پۆلیسی دەکەین،...
بەڵام گەر دەرکەوت بەڕاستی برازای جەنابی فیشەکەدینە، ئەوە لێی دەگەڕێین، وەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت. ناوە ناوە تەکین ئاغا دەکەوتە گیان دۆسیێەکان و سەروبنیانی دەکرد، پێشتر کەم کەم دەهات بۆ فەرمانگەکە، کەچی ئێستا زوو زوو دێت، بەردەوام چاودێریمان دەکرد وهەندێ جاریش هۆشداریمان دەکرد پێیمان دەگوت:
- دەسیان لێ مەدە، لێرە و لەوێ.. ئاگات لە خۆت بێت..
لەم ماوەیەدا بە تەواوی ناوی زڕا وبۆنی بڵاو بووەوە، بەرتیلی لە هاوولاتییان وەردەگرت، لە بەرامبەر بەخێرایی ڕاپەڕاندنی کارەکانیان...
کاك(عیرفان) یەکێکە لە کارمەندەکان، وتی:
- ئەم کەسە برازای فیشەکەدین نییە.
- نابێت.. نابێت.. وەلێ گەر بەڕاستی دەرکەوت برازایەتی؟
- ئەمە ڕاست نییە، چونکە ناوی ئەم کەسە تەکین نییە؟
- ناوی چییە؟

- دۆغان.
- بەڕاستیتە؟
- وەڵڵا بەڕاستیمە، چونکە لە سینەما لەگەڵ هاوڕێیەکیا بوو بینیم هەر بانگی دەکرد دۆغان، تەنها جارێکیش بانگی نەکرد تەکین.
بە خێرایی خۆم گەیاندە بەڕێوەبەر، ئەوەی گوێم لێبوو بۆیم گێڕایەوە، وتی:
- من دەمێکە هەستم بەوە کردووە، شوناس و ناسنامەکەیشی ساختە دەرچوو...
- کاتی ئەوە نەماوە دەستەوەستان دانیشین و هیچ کارێك نەکەین، پێویستە خێرا بیدەینە دەست پۆلیسەوە.
- باشە ڕاست دەکەی.. بەڵام گەر بەڕاستی برازای فیشەکەدین بوو؟ هەموو ئەو کارانە بەکردەوەکانی تەکین پێوانە ناکرێت.. دەسی دەسی بەچوار کچی فەرمانگەکەمان کردووە گوایە دەیانخوازێت.
زۆر پەست بووم لە کچەکان:
- تۆ بڵێی ئامادەباشیان هەبووبێت بۆ ئەم فریو خواردنەیان؟
دەبێ چاوەڕوانی ئەم پیاوە بووبێتن تا پێی بڵێن: وەرە هەڵمان خەڵەتێنە؟ کچەکان بەنیازبوون سکاڵای لەسەر تۆماربکەن، لێی دەترسان لە بەر ئەوەی برازای جەنابی فیشەکەدین بوو. دەرکەوت دەستی بێوەژنێکی بریوە لە بەشی بۆندەکان کاردەکات، دوانزە هەزار لیرەی لێ سەندبوو. بەڵێنی هاوسەرگیریشی پێدابوو، کارەکەرەکەش بەکوڵ دەگریا، چونکە لیرەی لەویش سەندبوو و بەڵێنی خواستنی پێدابوو.
هێشتا شەش مانگ بەسەر دامەزراندنی تێنەپەڕی بوو، فەرمانگەکەی سەروبن کردبوو، کارمەند نەمابوو دەسی نەبڕیبێت و دزی لێ نەکردبێت

و فریوی نەدابێت...لە کۆتاییدا تێکـــڕای کارمەندانی فەرمانگەکە کۆبوونەوەیەکیان ســـازکرد بۆ گفتوگۆ لەسەر مەسەلەکە. هەرکەسە و گازندە و سکاڵای خۆی پێشـــکەش کرد، دەرکەوت دووسەد لیرەشی لە دەرگاوانەکە وەرگرتبوو و بەڵێنی پێدابوو بە شێوەیەکی هەمیشەیی دایبمەزرێنێـــت و لە دوو مانگ پتر لە ماڵـــی یاریدەدەری بەڕێوەبەر دەژیا، ڕایەخ و ڕادیۆکەیانی فرۆشتبوو بۆ خۆی. کارمەندەکان بەنیاز بوون شـــکایەت لەو هەتیوە بکەن، بەڵام گەر دەرکەوت برازای جەنابی فیشەکەدینە! چیمان بەسەر دێت؟؟

یەکێك لە کارمەندەکان وتی:

- کەســـێکی وەکو ئەم چوختـــی و چەتوونە هیچ پێوەندییەکی بەوەوە نییە و بەهیچ شـــێوەیەك لە شـــێوەکان نابێتە برازای پیاوێکی ناسراوو بەناوبانگ لەلای هەمووان.

- کـــورە. ڕوحەکەم ئێمە دەزانین هیچ پێوەندی بەوەوە نییە، بەڵام گەر بەڕاســـتی برازای بوو، ئەگەرچی ئەگەرێکـــی لاوازە، مانای ئەوەیە هەموومان تیاچووین.

- با کەسێ لە خۆمان دیاری بکەین و بە نوێنەرایەتی بینێرین بۆلای جەنابی فیشـــەکەدین، لە ڕاســـتی مەســـەلەکە بکۆڵینەوە، ئەمەش دوابڕیارمانە. با جارێ ئەو بڕیارە وەلاوە نێین.. هەواڵمان پێگەیشـــت جەنابی فیشـــەکەدین بەنیازە ســـەردانی فەرمانگەکەمان بکات.ئێ. ئەمەیان چاکە.. (تەماشـــای پێناسەی گەنجەکە دەکات) و هەر کە جەنابی فیشەکەدین چاوی پێبکەوێ، مەسەلەکە ئاشکرا دەبێت..

هەموو لە ئامادەباشـــیدا بووین و حیســـابی خۆمان کرد بوو، تاکو بۆ ئەوەی دەس بەجێ ڕادەستی پۆلیسی بکەین...

کاك مشتاق گوتی:
- نا.. "تاکو تێڵاترێن و مارکوژی نەکەین" نایدەمە دەستی پۆلیس وهەتا تف نەکەمە سەر....
جەنابی یاریدەدەری بەڕێوەبەر وتی:
- هاوارە. کەس نازانێ من بە چ سزایەکی دەگەیەنم و چی بەسەر دێنم. یەکێ لەو کچانەی فریویانی دابوو، تاکە پێڵاوێکی بن بەرز و نووك تیژی خستبووە نێو جانتاکەیەوە و ئامادەی کردبوو تا بیکێشێ بەسەریا. هەریەکێك لە ئێمە شتێکی ئامادە کردبوو بۆ ئەو مەبەستە.
بە هاوکارانم وت:
- هەی هاوار.. توبی خودا با هەموو شتێکی لێ بکەین، مارهەنجنی بکەین، بەنیاز بووم و ئامادەشم کردبوو، بوتڵێ شووشە بخەمە ملی. هەواڵی هاتنەکەی جەنابی (فیشەکەدینمان) بۆ فەرمانگە لێی شاردەوە، چونکە گوێی لەم هەواڵە بوایە ڕەنگە ئەو ڕۆژە نەهاتایە بۆ دەوام.. هەوڵمان داو مەحاڵیشمان بەکارهێنا تاکو ئەو کاتە لە فەرمانگە ئامادە بێت، کە جەنابی فیشەکەدین تەشریف دێنێ.. جەنابی فیشەکەدین هات بۆ فەرمانگە و (تەکین)یش لە ژوورەکە بوو. بەڕێوەبەر هەوڵی دەدا هەرچۆنێك بێت و بە هەر ڕێگایەك بێ جەنابی فیشەکەدین بهێنێتە ژوورەکەمانەوە، هەموو فەرمانبەرەکان زۆر پەست بوون، بەزۆر دانیان بەخۆیاندا گرتبوو چاوەڕوانی بەیەك گەیشتنەکەیان دەکرد، هەرکەسە و شتی خۆی ئامادە کردبوو، چایچییەکە کتریەك ئاوی نابووە سەر ئاگر تاکو بە کوڵاوی بیکا بەسەریا، مەسەلەکە گەیشتبووە بەشی ئاسایشی تاوانەکان، سێ پۆلیسی مەدەنی ئامادە بوون و لە چاوەڕوانی ئەنجامەکەدا بوون، بۆ ئەوەی قۆڵبەستی کەن و لەگەڵ خۆیاندا بیبەن.

جەنابی فیشـــەکەدین هاتە ژوورەکەمان و بەڕێوەبەر و یاریدەدەرەکەی لەدوایەوە بوون.
کرێکارەکانیش هەموو لە پشـــتی دەرگای فەرمانگەوە بەدار گسکەوە وەســـتابوون. لەگەڵ هاتنە ژوورەوەی فیشەکەدین بۆ ژوورەکە، تەکین لەسەرەخۆ و بەئەدەبەوە لە شـــوێن خۆی هەڵسا و بەرەوپیری ڕۆیشت و کەوتە لێســـانەوەی دەســـتی و چەند جارێك ماچـــی کرد، جەنابی فیشەکەدین سەری لێشێواو بەسەرسووڕمانەوە وتی:
- خودا بەرخودارت کات رۆڵە.
تەکین:
- ئامۆژنم چۆنە؟
- سوپاس بۆ یەزدان... باشە
- ئامۆژنم چەند جارێك داوای لێکردم بێمە خزمەتت، بەڵام لەبەر نەبوونی کات نەمتوانی بێمە دیدەنیتان، من شەرمەزارم لە ڕاست ئامۆژنم و لەو کاتەی تۆ منت لێرە دامەزراندووە کاتم بەدەستەوە نەماوە..!
جەنابی فیشـــەکەدین جارێك ئاوڕی لە بەڕێوەبەر دەدایەوە و جارێکیش نیگایەکی تەکینی دەکرد، لە بەڕێوەبەری پرسی:
- ئێوە کەیفخۆش و ڕازین لە تەکین؟
- ئێمە دڵخۆش و شادومانین پێی گەورەم.
- کێ سەرۆکیەتی؟
بەڕێوەبەر ئاماژەی بۆ من کرد.. فیشەکەدین پرسیاری لێکردم:
- تەکین چۆنە؟ باش کاردەکات؟
- باش کار دەکات قوربان
- ئۆە.. ئۆە...

لە ژوورەکە چووە دەرەوە. تەکین دووبارە دەســـتی جەنابی فیشەکەدینی ماچ کردەوە.. ئێمەش هەر لە جێی خۆمان چۆن وەستابووین جووڵەمان نەکرد و هەروا ماینەوە..
لە پاش دوو مانگ تەکین مووچەکەی زیاد کرا، چەند ڕۆژێکی پێش ئەوەی تەرفیعەکەی بۆ بێت پێمی وت:
- سێ سەد لیرەم بدەرێ تا بیدەمە ئەو پزیشکەی راپۆرتێکی پشوودانی یەك هەفتەییت بۆ دەکات...
ئایا بیدەمێ یان.. نا؟! وا بیری لێدەکەمەوە..

# بووم بە سەرۆكی شارەوانی

بەخواستی خۆم نەبووم، ئەوان بەزۆر كردمیان، پێموتن!
- نابم.
- دەبــێ ببیت، ئەمە ئەركێكی نەتەوەییــە و كاتێكیش ئەرك دەبێتە نەتەوەیی ئاوی رۆیشتوو دەوەستێ و ئاوی مەنگیش رێدەكات.
هۆكاری هاتنم بۆسەر كورسی سەرۆكایەتی شارەوانی برنج و فاسۆلیابوو، بێگومان مافی 'كەمبوت''یش ( * ) نەخۆین، ئەویش بەشی خۆی هەیە، بەڵام فاسۆلیا هەر خۆی سەرەكیە، گەر دوو لەگەن فاسۆلیا لەگەڵ گۆشـــت و بیبەری سوور لەگەڵ برێك روبەهەنار نەبووایا، ئاستەم بوو ببم بەسەرۆكی شارەوانی.
ئێوەش دەبێت دوو قاپلەمە فاسۆلیا و قاپلەمەیەكیش برنج لەگەڵ چارەكە نانێــك بخۆن و كەمبوتیش هەڵقورێنن، دوایی بخــەون، دواتر دەبینن چۆن دەبنە سەرۆكی شارەوانی، من لەبەر خاكەڕایی خۆم و كەسێكی بەقەناعەتم بەسەرۆكایەتی شارەوانی قایل بووم، ئەگینا لەخەوێكدا نقوم ببوم دەیكردم بەپاشا! نەك سەرۆكی شارەوانی.

خەوی نیوەڕوان جودایـــە مرۆڤ خەونی تێدادەبینێ و دەزانێ خەونە، خەون بینین بەســـکی تێرەوە وەکو ژیانی سیاسی وایە، بەرز دەبیتەوە و هەڵدەکشێی وەلێ دەزانی دەکەویتە خوارەوە، کاتێك وەخەبەر دێیت. خێر دەبێت ئینشائەڵڵا. باسی خەوی نیوەڕوانتان بۆدەگێڕمەوە بەڕاستی و دروستی لەپاش فاسۆلیا و برنج و کەمبوت، جەستەم شل و خاوبوەوە و لەسەر دۆشەکەکەم راکشام.

لەدەرگا درا:.

- فەرموو.

سێ کەس زۆر بەڕێزەوە هاتنە ژوورەوە، قەڵەوەکەیان وتی:

- پیرۆزە، بوویت بەسەرۆکی شارەوانی.

- شۆخیم پێ مەکەن لەخەوندا !

- وەڵڵاهی بووی بەسەرۆکی شارەوانی.

- دەزانم ئەمە خەونە!

- خەون بێت یاخود راستی، ئێستا ئێوە بوون بەسەرۆکی شارەوانی.

- دەخوازم ببم بەسەرۆکی شارەوانی تاکو دڵی هەموو دانیشتووانی شار رازی بکەم.

لەپاش ئەوەی چووم بۆ باڵەخانەی شـــارەوانی، یەکەم شـــت کە کردم خوێندنەوەی رۆژنامەکان بوو، یەکێك لە تەنز نووسەکان بابەتێکی لەژێر ناونیشانی "ئەم شـــارەوانییە چۆن کار دەکات؟ " نووسیبوو، گازندەی لەنەبوونی ئاوەڕۆ دەکرد لە گەڕەکەکەی خۆیان.

شارەکەمان کردە چەند بەشێکەوە، دوای ئەوە بەپێی پلان و نەخشەیەکی داڕێژراوەوە هەڵساین بەدروستکردنی هێڵەکانی ئاوەڕۆ، بۆ رۆژی دوایی قیامەت لەرۆژنامەکان هەڵسا:

- ئەم ســـووکایەتیکردنە چییە...؟! ئایا دەبێت شارەوانی ئاوها بێت؟ شـــەقامەکان بوونەتە کولانە کەروێشك کون کون و کۆندڕ، بەپسپۆڕانم وت:
-چـــی روودەدات؟ هاوولاتیان ســـکالا دەکەن مافـــی خۆیانە، خێرا شەقامەکان چاك بکەنەوە.
یەکسەر دەسکرا بەچاککردنەوەی شەقامەکان و جوانکردنی شۆستەکان و نۆژەن کردنەوەی ڕێگا و بانەکان، بۆ رۆژی دوایی داباریـنە سەرمان داباریـنێکی چڕ " شـــارەکەمان بەدبەخت و بێ نەوابووە، شارەوانی هەر لەدووی روخسار و خۆهەڵکێشان دەگەڕێ ".
دەس لەنۆژەنکردنـــەوە هەڵگرن و چاڵ و کون و قوژبنەکان پڕ کەنەوە، ئەمجارەیـــان رۆژنامەکان گازندەیـــان لە قەرەباڵغی شـــەقامەکان و مەشەقەتی هاتوچون دەکرد، لەپاش ئەوە یەکەم کار کردم کڕینی خانوو موڵکی خەڵکـــی بوو بۆ میری و رووخاندمان ئەم کارەش کێشـــەی گەورەتری بۆمان خوڵقاند، یەکێك لەرۆژنامەکان:"شارەوانی سێ داری ســـەرووی بڕییەوە بەبیانوی کردنەوەی رێگا. هەرچی سەوزایی هەیە بـــن بڕی دەکات ".. رۆژنامەیەکی تر: بەبیانوی فراوانکردنی رێگا و بان شارەوانی ئاودەسی بەکر پاشای مێژوویی و دێرینی رووخاند، ئەمە تاوانە ئەم گەلە بەبێ شـــەقام دەژی، وەلێ هەرگیز رازی نابێت بەبێ مێژوو بژێت ".. فەرمانمدا لەهەموو شەقامەکان داری سەر و بچێنرێت و ئاودەسی بەکر پاشای مێژوویی و دێرینیش نۆژەن بکرێتەوە، لەپاش ئەوەش رۆژنامەکان بەهێزترین هێرشیان کردە سەرمان، گەر لەشارێکدا نەباخچە هەبێ و نەسەوزاییەك، نەمام ناشتن لەشەقامی تەنگەبەرەکان هەڵخەڵەتانـــدن و خۆڵ کـــردن نییە بەچـــاوی خەڵکیدا؟ بەتایبەتی

نۆژەنکردنی کۆمەڵێ تاشەبەرد کە ناویان لێ ناوە ئاودەسی مێژوویی؟!..
هەموو فلسێك ناهێنن، بەڵکو تارماییەکە لەبەرامبەر خانووی هاووڵاتیان
و هیچ گرنگیەکی مێژووییشی نییە.
ڕۆژنامـــەکان مافی خۆیانە ودەنگی رای گشـــتین، بۆیە بڕیارێکی
نوێمـــان دەرکرد بە رووخاندنی ئاودەســـەکان و بڕینـــەوەی دارەکان و
دروستکردنی باخچەی گشتی و باخچە و یاری بۆ منداڵان و چاندنی
سەوزایی، داوامانیش کرد بەزوترین کات بڕیارەکە جێبەجێ بکرێت، سێ
ڕۆژی نەبرد دەنگی ڕۆژنامەکان بەرزبووەوە " هاووڵاتی ســـەربانێکی
دەس ناکەوێت تاکو سەری لەژێری دانێ، کەچی شارەوانی خانووەکان
ئیستیملاك دەکات ". فەرمانمدا بەدروستکردنی خانووی نوێ لەجیاتی
ئەوانەی ئیستیملاك کران و چاندنی دار لەملاو لەولای ڕێگا و بانەکان
ڕۆژنامەکان نوێنەری رای گشـــتین، هیچ وشەیەك نەما نەیڵێن: ئەم
پیسانە روخسار و دیمەنی شارەکەیان شێواندووە، دارگەز خۆی پیسە و
لەخاکی خراپ شین دەبێت، خاکێکی رەق و قسڵ رەنگە بۆ ئەوروپای
ناوین بەکەڵك بێت نەك بۆ شارە مێژوویەکەمان، چونکە داری تایبەت
بەخـــۆی هەیە وەکو ســـەر و و دارەبی، ئـــەم خانوانە چین کە هیچ
شـــێوەیەکیان نییە؟ دەڵێی کارتۆنی شقارتەن!.. وەلێ دەلێی شارەوانی
چاوی نوقاوەو هیچ جوانییەك نابینێ ؟!
دروستکردنی خانووەکانم راگرت و فەرمانمدا خانو لەچەشنی خانوەکانی
سەدەی شانزەهەم دروست بکرێت، هەروەکو خانوی تورکیی گەورە و لەیەك
نهۆم دروست بکرێت، هەروەها چاندنی داری سەرو، ئەو ڕۆژنامانەی
کە بەناوی رای گشـــتی دەدوێن، وتیان: ئەم دارانە شـــارەکەیان لێ
کردووین بە گۆڕستان، ئەوروپییەکان خانووی فرە نهۆمیان پێ چاکترە

و ئێمەش، خانوی یەك نهۆمی دروست دەکەین؟ ئای لەم گەمژەیییە!
خانوو بەکەمترین نرخ و ماندووبوون، چاندنی دار و درەخت لەشارێکدا
کەشەقامێکی تێدا نییە بەدی ناکرێت خەڵکی بەسەریا گوزەر بکات و
نەئاوەڕۆی هەیە، هەوڵدانێکی دیار و روونە، کە تەنها بۆ خۆ دەرخستنە..
دەبێ وشەی راستی چی بێت تاکو بوترێت؟!
هەموو تواناکانم بۆ ئاوەڕۆ خستە گەڕ، سەرلەنوێ رۆژنامەکان!"
رێگاکان هەمووی هەڵکەندراون، ناتوانین بەپێ بڕۆین ناچارین بە
ئۆتۆمبێل هاتوچۆ بکەین هەروەك ئەوەی شارەوانی کێشەی گرانی
بازاڕی چارەسەر کردبێت و ئێستا نۆرەی رێگا و بانە "!.
هەموو کارمەندانی شارەوانیم بانگهێش کرد و پێموتن!لەمڕۆ بەدواوە
هیچ کارێك ناکەن، لە بینای شارەوانی پاڵی لێبدەنەوە بۆخۆتان دانیشن..
ئینجا رۆژنامەکان:" ئەم گوێ نەدانەچییە؟ ئەم شارەوانییە تەمبەڵ و
تەوەزەلە چییە؟ ".
کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیم گرێدا و هەموو رۆژنامەنووسانم بانگهێشت
کرد و پێموتن: بەڕێزانم وتیان ئاوەڕۆ دەس بەکاربوین وتتان چاڵ
لەشەقامەکاندایا شەقامەکانم داخست، دوایی وتتان گۆڕەپان، لەئاهەنگی
کردنەوەی گۆڕەپانەکە وتتان: شارەوانی شوێنەوارە مێژوویەکان
دەڕووخێنێ و کاتێکیش ویستمان شوێنەوارەکان نۆژەن بکەینەوە، وتتان
خانوو پێویستە، لەپاش ئەوەی هەرچییەك لەناخما هەبوو هەڵم رشت
پێموتن:
- داوا بکەن وبلێن. ئێستا هەموومان لێرەین هەرچیشتان بوێت شارەوانی
جێبەجێی دەکات، لەو شتانەش دوور دەکەوینەوە کە ئێوە ناتانەوێت.
یەکێك لەرۆژنامەنووسەکان هاتەپێش و وتی:

- تۆ بەوپێیەی سەرۆکی شارەوانیت لەوە گەڕێ کە دەیڵێین و دەینووسین، ئێمە ناچارین سەرپێچی بکەین، تاکو رۆژنامەکانمان رەواجی ببێت گەر رەخنە لەمە بگرین نابێت و گەر رەخنە لەوەش بگرین سەرمان دەکەن بەقوڕا و تووشی بەڵا دەبین، گەر رەخنە لەفڵانە کەسیش بگرین دەمانداتە دادگا و فڵانیش وەڵامێکی بەدرۆخستنەوەمان بۆ رەوانە دەکات و ئەمەش دەبێتە مایەی تووڕەبوون، جا لەبەر ئەوەی شارەوانی لەهەموو فەرمانگەکانی تری میری نەرمونیان ترە، هێرش دەکەینە سەری کاتێك دەڵێین: دار گەزی پیس مەبەستمان پلەو پایەی فڵانەکەسە، یان شەقامە تەنگەبەرەکان مەبەستمان شوێنی فڵانەکەسە، گەر وتیشمان کونەکان ئەوە مەبەستمان شتێکی ترە...

- باشە بەڕێزان، خوێنەران لەمەبەستتان تێ دەگەن، ئێوە رەخنە لەچی دەگرن؟

- بەڕێزان...من تاکو ئێرە لەخەونیشدا ناتوانم سەرۆکی شارەوانی بم، بۆیە دەس لەکار دەکێشمەوە.. " ئێوەش دەسنوێژەکانتان هەڵگرن و قاپقاپەکانم بدەنەوە ".

کاتێك لەخەوەکەم ئاگاداربوومەوە لەناو ئارەقەی خۆمدا مەلەم دەکرد، بەمجۆرە سەرۆکایەتی و شارەوانی بەبرنج و فاسۆلیا دێتەدی.. لەو رۆژەوە تاکو نهۆ بۆئەوەی خەونی ترسناك نەبینم بەئاگابوونەوە دەخەوم.

(*) کەمبوت: جۆرە شلەمەنییەکە لەشەکر و ئاردی گەنمەکوتا و و مێووژ و فستق و کاکڵە گوێز، دروست دەکرێت، لە کوردستانی باکوور پێی دەڵێن " ئاشوورا".لای خۆشمان پێیدەڵێن {هەریسە}وەرگێڕ.

# ترس لە چی؟!

کێ؟...من....ها؟ بوودەڵە و ترســـنۆك؟ هـــا!. کێ بەتۆی وت من دەترسم؟.. هەموویان؟ ئێ باشە کەی؟ کێ زانی من ترسنۆکم؟ درۆزنە.. درۆزنێکی بەترەفە، من نازانم ترس هەرچیشە و لە کەسیش ناترسم... و ناشترسم؟!. خوای لێ دەرچێت، مرۆڤ لە کەس ناترسێ...؟ ئێ ئێ... ترس لە خوا؟ ئەمە شتێکی ترە؟؟ شتێکی سروشتیە...ئەدی ناڵێن: لەوە بترسە لە خوا ناترسێ، وانییە؟ بەڵێ...لەو کەسە بترسە لە پەروەردگار ناترسێ.. لە مەبەستم گەیشتی؟ لە غەیری خوا نەبێت لە کەس ناترسم، هەر نازانم ترس چییە؟ هەموو مرۆیەك وەکو من مرۆڤن، ئیدی ترس لە چـــی؟.. چۆن؟.. لە دایك و بابم؟... ئێ ئێ.. ئەوە جاری جاران بوو هەینێ بچووك بووم، ئاســـاییە منداڵ تا چەند ساڵێکیش لە دایك و باوکی بترسێ...! مرۆڤ چەند گەورە بێ لە چاو دایك و بابیەوە هەر بەبچووکی دەمێنیتەوە، وانییە؟.

ئەزیش هەر وابووم تا گەیشتمە تەمەنی چل و شەش ساڵی. دوای ئەوە مردن. بەڕەحمەت بن..!..نا..! ئەمەی وتت راست نییە، من لێیان ناترسم،

دڵنیابە...لەبەر ئەوەی کۆچی دواییان کردووە !...
بەڵێ گەورەم؟.. لــە مردووەکان؟ هاه...ئەمە عەقــڵ نایبڕێ، مردو دەمترســێنێ؟؟ ئاخر تــرس بۆچی و مردوو چی لەدەســت دێت..؟ هێندە بەســە کە مردووە !! بەکورتی من ترس ناناسم دەکرا گەر هێشتا نەمردبایە، وەلێ پاش ئەوەی مردوو بووە لاشەیەکی بێ گیان. ناتوانێ کەس بترسێنێ..چۆن؟ کاتێك پوورم ئەمری خوای کرد؟ ئا...ئەو..کا. ئەو کاتەشەو بوو، منی لێ بترازێ کەسی تر لەماڵێ نەبوو..لە نیوەشەوا گوێم لە دەنگێك بوو..رامکرد بەرەو ژوورەکەی. بەڵام کۆتایی بەژیانی هاتبوو..لەو کاتەدا دەخوازی چیبکەم؟ چووم بۆ ئوتێل وەلێ لەترســان نەبوو !! لەو هەتیوەی گەڕەکەکەمان دەترسم؟ نەخێر. هەرگیز لێی ناترسم بەڵکو لەســەر ئەو پەندە دەڕۆم کە دەڵێ: "نەشەیتان ببینە و نەقولووەڵا بخوێنە ". کە لە کۆڵان بێت من دەرناچمە دەرەوە هەر لەبەر هەیوانەکەوە لێی دەڕوانم، گەر لەوێ نەبێ ئینجا بەکۆڵانەکەدا تیژ تێدەپەڕم!چیتان فەرموو..؟ لە مامۆســتاکانم..؟..نا. راست نییە من لە مامۆستاکانم ناترسم..ئەوەی تۆ مەبەستتە کە گوایە ترسە، لەهەست کردن بەگەورەیی رێزگرتــن هیچی ترنییە، بڕوانە کاتێك دارکاریــم دەکەن هەر لەرێز و خۆشەویستی زیاتر هیچی ترم نییە بۆیان..چی؟. لەترسی لێدان لەدەست مامۆســتای مێژوو هەڵهاتم؟. نا نەخێر. لە ترســان رام نەکرد. بەڵکو رێزم لە شــکۆمەندیەکەی گرت. ئەم قسە هیچ و پووچانە چین؟؟.. ئەقڵ دەیبڕێت قوتابی لە مامۆســتاکەی بترسێت؟ چیتان فەرموو؟ لە تاقیکردنــەوەکان؟ بەدڵنیاییەوە نا. کاتێك دەچمە هۆڵی تاقیکردنەوەکان لەرز دەمگرێ. لە ترسان نا بەڵکو بەهۆی دڵەڕاوکێوەیە. چۆن؟ لە بەردەم دەرگای هۆڵی تاقیکردنەوەکان میزم بەخۆمدا کرد؟! ئەم بوختانە لەچی؟

بەهۆی پەژارەییەوە بوو. هەر کەســێك فریای ئاودەس نەکەویٚ ئاوهای بەســەر دێت. بەڵێ گەورەم. تەنانەت لەسەرنەکەوتن و مایە پووچیش ناترسم؟ خودایە گیان درۆزن چەند زۆرن. مادامەکی هێشتا نەمردووم. هەڵبەتە. گەر ســەرنەکەوتن، هەلی سەرکەوتنم لە داهاتوودا لە پێشە. وانییە؟ بەڵام لە ژنەکەم دەترســم؟..کیٚ ئەم درۆشاخدارەی کرد؟. توبی خودا لیٚتان دەپرسم، میٚرد دەترسیٚ؟ بەڵیٚ.. کام پیاو لە ژنەکەی؟!! ناکریٚ و نابیٚ ناوی لیٚ بنریٚت ترس.. ئەویش ژنە. بۆ ئەوەی بە ئاســوودەیی بژیت نەرمونیان بی لەگەڵیا و بیحلمیٚنی (*) تاکو ئاژاوە روونەدات و دەنگتان دەرنەچیٚ و دەرودراوسیٚ گوێی لیٚتان بیٚت، تا منالەکانت بەرەڵلا نەبن..!! ئەگەر نا. بۆچی لە ژنەکەم دەترسم..؟؟..من لە ژیانما لە کەس نەترساوم، نەخوازەلا لە ژنەکەم. ها. کاتێك لە خزمەتی سەربازیدا بووم؟. چیتریش.. لە فەرماندەی فەوجەکەم؟ من گویٚ نادەمە فەرماندەی سوپا بەو هەموو توانا و جەربەزەییەوە، نەخاســمە لە فەرماندەی فەوجەکەم! مــن گەورەم. کاتێك خۆم بۆ خزمەتی نیشــتیمانەکەم تەرخان دەکەم لە کەس ناترســم، ئەویــش وەکو من و تۆ مرۆڤــە.. کەواتە. ترس لەپای چی؟؟..چی؟ کاتێك فەرماندەی سوپا بەقامچی لیٚی دام..نا. ئەمەیان شتێکی ترە. خۆی فەرماندەی سوپایە و خاوەنی بڕیارە..لیٚمان دەدات. خۆشی دەویٚین. کەس بۆی نییە خۆی لەوە هەڵقورتیٚنیٚ..لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ناترسم. من بەدرێژایی ژیانم نەترساوم..قەتیش ناترسم. ئەریٚ وەڵلا. وتم. لە منداڵیما، نەترســاوم، چونکە خۆم لەبەرچاوان ون دەکرد، لە ترسی ئەوەی شتێك روونەدات. لە تاریکی؟..ئایا تاریکی ترسناکە؟ هــاە. جیاوازی چییە لە نێوان تاریکــی و رووناکیدا؟ هەر دووك وێك دەچن. من. بەشەو لە تێپەڕبوون بەلای گۆڕستاندا ناترسم. لەبەر ئەوەی

قەت بەلاییدا تێناپەڕم. چ ئیشـــم بەگۆڕســـتانە !. تاکو بەشەو بەلایدا گوزەر بکەم؟ من بەڕۆژ نزیکی ناکەوم، نەبادا بەشەو..چی؟ وەڵڵا من بەشـــەوان نەفیکە فیك دەکەم و نەگۆرانی دەچڕم.. راســـتە. وەڵلا بە هۆی ترسەوە نییە، چونکە بە رۆژەوە گیزەگیز دەکەم و گۆرانی دەڵێم. ئەمـــەش فووە. ها. بەڵام لە دڵی خۆمدا بەشـــێوەیەك کەس گوێی لێم نابێت..لە خەون دەترسم؟. چی..؟ ئەم پەندە چییە بۆمتان هەڵبەستووە؟.. نا...هاوارکردنم لە شـــیرینی خەودا بە هۆی ترسەوە نییە، بەدەم خەوەوە هاوار دەکـــەم، چونکە گەر بەخەبەر بم قەت هـــاوار ناکەم.. چۆن..؟ لە پیاوانی پۆلیس دەترســـم؟..لە پاسەوانان و هاوشێوەکانیان؟ چی لە خزمەتکاری ئوتێلانیش؟. لە شۆفێری ئۆتۆمبێلەکان؟؟!!! کێ ئەمەی بۆ هەڵبەستاوە؟ پۆلیس و مۆلیس و بەندیخانە و مەندیخانە و ئاسایش و ماســـایش هەبێت یانە بێت من ناترسم!چونکە من لە بنەڕەتدا پیاسە هەر ناکەم. هەموو ئەوانەی دەیڵێن درۆ ودەلەســـەی دروستکراون. شێت و سەرخۆشـــان؟؟. قەســـتەم بەخوا درۆیە. من لە کەسیان ناترسم...لە غوڵماندنی (**) نێو جێگەی خەو بۆ مومارەسەکردن؟! لە ترسان نییە. من خۆم ناخەمە نێو پێخەفەوە؟؟..نا. بەڵکو بەهۆی شەکەت بوونەوەیە کاتێك لـــەکار دەگەڕێمەوە بەماندوویەتی.. چیتریش؟ لەژنان دەترســـم بەهۆی کەمتەرخەمیـــەوە؟ ئەم گاڵتە جاڕیە چییە هەی بنیادەم؟؟کێ ئەم هەموو قســـە تڕوهاتانەم بۆ هەڵدەبەستێت؟؟ هەموو ئەم قسەڵۆکانە درۆن. درۆ؟؟ چـــۆن؟؟ لەمانـــەوەم بەتەنێ لەماڵێـــدا؟؟ لە وتووێژی توندوتیژ؟؟ لەدرەنگ مانەوەم بەشەوان لەدەرەوەی ماڵ؟. لەهاوکارانم؟.. ها. لەبەڕێوەبەرەکەم؟؟ لەمردن بەکارەساتی ئۆتۆمبێل؟. لە دراوسێکان..؟ لەکۆبوونەوەی کۆمیتەی بنیاتنان؟ لە چی تریش. چی ترماوە؟؟ گەورەم

من ناترسـم. نا.. تاکو کوڕە گەورەکەشم ناو ناوە (ئازا)! بچووکەکەشم (سامناك)!! ترسم لە نەخۆشی هەیە؟.
بەدڵنیاییەوە..نەخێر...من لە نەخۆشـی ترسم نییە..بۆچی؟ وتت بۆ؟ بەڵێ بیرم چوو چیت لێ پرسم،من وا ماوەیەکە ئەو جۆرە پرسیارانەم بیر دەچێتەوە، کە بەو شـێوەیە پرسیارم لێدەکەن. نا. ناترسم نە لە نەخۆشی و نەلەمردنیش. ئەدی فەیلەسـوفێك نەیگوتووە:" ئێمە ماهیەتی مردن نازانین لەبەر ئەوەی زیندووین، کاتێکیش دەمرین ماهیەتی مردن نازانین لەوەی وتی...ترس لەسبەی؟ مەبەستت چییە؟ سبەی چوارشەممەیە من لەچوار شـەمموان ناترسم و نەلە پێنجشەممونیش، لەسبەینێم؟ ئاه. مەبەسـتت مانەوەمە بەبێ کار و بەدەسـت بەتاڵی؟...خودا دەزانێ.. کەواتـە. بۆچی ترس لەسـبەینێ..تا بەیانی خـوا خۆی دەمێنێی و موڵکی، بەڵام دەترسـم ئارەزوتان لەوەبێت بمدوێنن و گفتوگۆم لەگەڵدا بکەن. لەقەدەغەکراوەکان دەترسـم؟.. نەخێر. هەموو قەدەغەکراوەکان لە پێناو ئێمەدا هاتوونەتە کایەوە. سوپاسـی بەرپرسانمان دەکەین ئەوانەی بیریان لەبەرژەوەندی ئێمە کردۆتەوە...من نەدەیانشـێلم و نەزیادەڕۆییان لەسەر دەکەم، کەواتە بۆچی لێی بترسم؟؟ مادامەکی هەموو کاتێك لە ماڵەوە ئەم دەسـتەواژانە دەڵێنەوە "خێر دەبێ ئینشەڵڵا "، "ماشەڵڵا بەرەو باشی دەڕوات "، سوپاس بۆ گەیشتنمان بەم قۆناغە ".. ئیدی بۆیە ئێمە نەلەهەورە تریشـقە و نەلە بروسکە دەترسین؟..ئەمە ئەقڵ ئەیگرێت..؟ ها.. ئەم دیاردەسروشـتیانە مرۆڤ دەترسـێنێ..؟ بـرای بەڕێزم من ناترسـم.. چاك تێبگە من ناترسـم گەر لە ناکا و یەکێکیان لەبەردەمم قیت ببێتەوە!! چی؟ دەترسم رادەکەم؟.. ئاه. ئاژاوەگێڕان چەند زۆرن. من لە بانگهێشـی شایەتیدان دەترسم؟. نەخێر. من شایەتیم بۆ کەس نەداوە

لەژیانما و نەبانگهێشی شایەتیدانیش کراوم..هەر کاتێك پرسیارێکم لێ کرابێت وەڵامم داوەتەوە. بێ ئەوەی بزانم. شـــایەتی نادەم. دەترسم کاتێك لەدەرگامان دەدرێت، لەوەی کە میوانەکە ئێسك گران و رەزاقورس بێت و نەچێتە دڵەوە، ئاوها؟ لەنامەو زەرفە پێچراوەکان؟. لەوەرگرتنی بانگهێش کردنی دادگا. یان بۆ لێپرســـینەوە؟ من لەوە دەترســـم نەك داواکردنی دانەوەی قەرزی بانك. سوێندت بۆ دەخۆم..ئەمانە هەمووی درۆن درۆ. لەواژۆ دەترســـم؟ نامامە گیان. من شـــتێك ناخۆم (با)ی پێ بکەم و ســـك ئێشـــەی پێ بگرم !. هەندێك دەڵێن: دەترسم لە ئیمزاکردن لەسەر خشتەی مووچە وەرگرتن. نامامە گیان. ئەمانە هەمووی هەڵبەستراون. مەبەستت لەوەیە من لەپەیڕە و پرۆگرام دەترسم؟.. لەتەلەفۆن رادەچڵەکێم؟ چۆن؟. کێ چاوی لێ بووە؟ ها. با هەر چاودێریم بکات، من چ ئیشم بەسەریەوە؟ من ئەسڵەن قسە لەسەرشـــتێ ناکەم مەترسیدار بێت. هەر کاتێکیش هەست بکەم کەسێك هەست لە قسەکانمان رادەگرێ یەکسەر بیستگەکە دادەخەم.. ئەم هەڵسوکەوتە ناو دەنێی ترس؟..
لەچی؟ لە بولبلی کەناری بەندکراو لە قەفەســـدا..؟.. ئاە. ئەم قســـە پـــڕ و پووچانە چیین؟.. لە گوڵدان و قەنەفڵی چێنراو لەناوی؟.. لە گوڵدان؟.. لە زەنگی کارەبایی؟ نەخێر..نا دکتۆر من ناترسم بەسە لەوە زیاتر مەمتۆقێنە..من ناترســـم دکتۆر گیان..لە کەس ناترسم.. چی. دکتۆر؟. من لە کەس ناترسم...وەلێ خۆم دەترسم دکتۆر. ئم م م. ناترسم پێویست بەترس ناکات؟؟ کوورەی ترس کوژانەوەی نییە دکتۆری بەڕێز، وانییە. بەڵام دەترسم قسەکانت لێ پرسینەوە بن لە من!!!

**(*)بیحلمێنە: بید وێنە، دڵی راگرە.**

**(**)غوڵماندن: گەوزاندن، دەسبازی ژن ومێرد.**

# پشیلەیەکی بەختەوەر

دوێنێ لە ئاهەنگی کردنەوەی پێشانگەیەکی شێوەکاری یەکێك لە خانمە هونەرمەندێکی بەناوبانگ ئامادە بووین، کەشـــێکی لێك تێگەیشتن و خۆشەویستی باڵی بەسەر ئاهەنگەکەدا کێشابوو، لەمیانەی گفتوگۆکانەوە باس لە زۆر شـــت کرا، لە یەکێك لەباســـەکان، خانمە هونەرمەندێکی بانگهێشت کراو هەڵیدایە و گوتی:

- دوێنێ شەو خەونێکی هەراسانکراوم بینی.

یەکێك لە شاعیرە بانگهێشتکراوەکان پرسیاری کرد:

- خەونێکی ناخۆشت بینی ؟

- خەوێکی ئاڵۆز و نامۆ بوو، هیچ لە ماناکەی تێنەگەیشـــتم، کەسێك هەیە لە نێوتان لە لێکدانەوەی خەون بزانێ؟

- ئادەی خەونەکە بگێڕەوە.

خاوەنی خەونەکە دەستی بە گێڕانەوە کرد:

- لەوێ کۆمەڵێ خەڵك هەبوون، هەر کەسە و بەڕێی خۆیدا دەڕۆیشت، منیش بەنێو ئەو خەڵکەدا دەڕۆیشـــتم، لەپڕ یەکێك لەنێو حەشامەتەکەوە

هاواری کرد (من) ئاوڕمان لە سەرچاوەی دەنگەکە دایەوە، هەر ئەو پیاوە گوتی: "هەر کەســـە و لە شـــوێنی خۆیدا با ڕاوەستێت." بەبێ چەندو چوون بە گوێمان کرد، پەیکەســـازێك کە گوێ بیســـتی گێڕانەوەی خەونەکە بوو گوتی:

- بۆچی ڕاوەستان؟

- من نازانم، هەموو ڕاوەســـتان منیش وەکو ئەوان لەجێی خۆم نەبزووم. دوایی هەر ئەو پیاوە هاواری بەسەردا کردین و داوای لێکردین بە تەباشیر هەر یەکە و بازنەیەك بەدەوری خۆماندا بکێشین، هەندێکیان سەروپارچە تەباشیریان دەرهێنا و دەستیان کرد بەهێڵکێشان، چەند کەسێکیشیانوتیان: تەباشیرمان لا نییە، ڕێگەی پێدان قەڵەم بەکاربهێنن لەجیاتی تەباشیر، هەموو داچەمانەوە ســـەر بەردی شۆســـتەکە و ئەو بازنەیەیان کێشا کە داوای لێیـــان کرد، بەڵام من گیرفانەکان و جانتاکەم هەموو پشـــکنی نە تەباشـــیر و نە قەڵەم و تەنانەت قەڵەمی ســـووراوی دەم و لێویشـــم نەدۆزییەوە، لەترســـاندا ڕاچڵەکیم و هەموو گیانم کەوتە لەرزین، تاکو گوێم لە یەکێکیان بوو بەدوودڵییەوە دەیگوت، هیچ شتێکی پێ نییە تاکو قەڵەمیشی پێ نییە با لە هەوادا وێنەی بازنەیەك بکێشێ".

یەکێك لە گوێگرانی گێڕانەوەی خەونەکە:

- باشە بۆچی وێنەی ئەو بازنانەتان کێشا؟

- ئەوە منیشی سەرگەردان کردووە بەشوێن شرۆڤەکردنی.

- هەندێ جار خەونەکان دوورن، لەوەی عەقڵ و لۆژیکێك قبوڵیان بکات.

خانمە هونەرمەندەکە بەردەوام بوو لە گێڕانەوە:

- دوای ئەوەی وێنەی بازنەکانمان بە دەوری خۆماندا کێشـــا پیاوەکە بە سەرماندا قیڕاندی: 'کەس لە بازنەکەی خۆی نەچێتە دەرەوە".

بەپێی بڕیارەکە هەموو لەنێو بازنەکانماندا ڕاوەستاین، یەکێك لە شاعیرەکان پرسی:

- نەتان دەتوانی لەو بازنانە دەرچنە دەرەوە؟

- نەخێر.

- بۆ؟

- دەرچوونی لێ قەدەغە کردین.

- ئێ خۆ ئەو بازنانە سنووری بینراوی نەبوو؟

- بەڵێ بەڕاستی بە پەنجەکانی خۆم کێشام، وەلێ لە مێشکمدا شێوەی دیار و ڕوون بوو.

- لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەتتوانی لێی دەرچی.

- کەسێکم نەبیننی دەرچێ لێی و زاتی ئەوە بکات سەرپێچی بڕیارەکەی بکات؟

- زۆر چاوەڕێم کرد و هەستم بە بێزاری وەڕسبوونێکی کوشندە کرد، ئیدی بیرم لە ڕێگەچارەیەك کردەوە بۆ دەرباز بوون لە بازنەکە، بە خەیاڵما هات، ئەو بازنەیە بەدەست بسڕمەوە، پیاوە دەعباکە هاواری کرد: "کەس بازنەکەی نەسڕێتەوە".

یەکێك لە نووسەرە بانگهێشتکراوەکان گوتی:

- چاکتر نەبوو هەر لەسەرەتاوە ملکەچی بڕیارەکانی نەبوونایە و وێنەکردنی بازنەکانت ڕەتکردایەتەوە کە بەدەستی خۆتان، خۆتان زیندانی کرد؟

- بەڵێ ئازیزم قسەکەت جوان و لە جێی خۆیدایە، بەڵام لێگەڕێن با ئەو خەونەی بینیم بۆتانی تەواوکەم. ئەوەی ڕوویدا بەبێ کەمترین بیرکردنەوە جێبەجێمان کرد، لەو شتانەی کە بینیم:

پیاوێکی پەککەوتە پێی گوتم: "من کەمئەندامم و نزیکەی بیست

ســـاڵە پەککەوتەم و توانای جوڵانەوەم نییە، بەڵام ئێســـتا هەســـت بە ئارەزوویەکی سەرسەخت دەکەم لەم بازنەیە دەرچم، کە بڕوام وایە هۆکاری نەخۆشییەکەمە، بەڵکو بۆتی دەسەلمێنم کە دەتوانم غاربدەم، گەر بێتوو ئەم بازنەیە نەبوایە".

- دیمەنێکی تریشم بینی کە زۆر سەیر بوو، ژنێك مرد بوو، بەڵام قسەی دەکرد، گوێم لێ بوو دەیگوت: "لەو کاتەوەی مردووم هەستم بەئارەزووی ڕۆیشـــتن و بازدان نەکردووە، وەلێ لە پاش ئەوەی وێنەی ئەم بازنەیەم کێشـــاو قەدەغەکرام لە دەرچوون، لە هەناومدا حەزێکی بەهێز گوشاری بۆ هێنام بۆ پیاسە کردن و قەڵەمبازی، گەر ئەم بازنەیە نەدەبوو منیش وەکو ئێوەی زیندوو پیاسەم دەکرد. گەنجێك لەوێ بوو و هەر دوو قۆڵی بڕابووەوە دەیگوت: " گەر کەسێکتان ئەم بازنەیەی دەورم بسڕێتەوە لەوەیە ئەم شوێنە جێبێڵم" بیرم دێت پرسیارم لێکرد: "باشە چۆن توانیت وەکو ئێمە وێنەی بازنەکەت کێشا".

وەڵامیدایەوە: "من لە خەیاڵمدا وێنەکەم کێشا، کەچی ئێستا بوونی هەیە و دەوری داوم و ناتوانم لێی دەربازبم".

پیاوێکی دیکە لە دوورەوە دەیگوت: "ئایا بڕیار بە سڕێنەوەی ئەم بازنانە نەدرا؟" یەکێکی تر:

" فریادڕەســـێك نییە لەم قەیرانە ڕزگارمان بکات؟ "ئایا کەسێك هەیە بتوانێ ئەم بازنانەمان بۆ بسڕێتەوە؟".

"فریاگوزارێك نییە لەم زیندانە ڕزگارمان بکات؟ !!".

کات لە سەرەخۆ تێدەپەڕی و بە قورسی بەسەر دڵماندا گوزەری دەکرد و خۆریش ئاوابوو، تاریکی بوو بە پۆشاکێکی ڕەش و شوێنەکەی داپۆشی، ئێمەش هەر لە جێگای خۆمان وەستابووین و زاتی جووڵانەوەشمان نەدەکرد،

هەموو لە دڵی خۆیاندا بڕیاریان دابوو گەر کەسێکم بینی دەرچوو، منیش هەروەها دەردەچم، ئا لەم کاتەدا پشـــیلەیەکی ڕەش لێمان نزیکبووەوە و هەردوو چاوی لە تاریکەکەدا وەکو دوو پارچە ژیلەمۆ دەردەکەوتن، کەوتە پیاســـەکردن بە نێوماندا بە کەیف و ماشای خۆی دەچووە نێو بازنەکان، دەردەچوو، بە هەموو سەربەستییەکەوە لە شوێنێکەوە دەچوو بۆ شوێنێکی تر، لە ناخمدا هەســـتم بە ئیرەیی کرد، هەموو بەیەکەوە گوتیان: (ئای چەند بەختیارە! پشیلەکان گیانلەبەری بەختەوەرن، خۆزگە ئێمەش وەکو ئەو پشیلەیە دەبووین". وەکو ئەوەی هەستی بەوە کردبێت کە وتمان، کەوتە یاریکردن و هەڵبەز و خۆشـــی وەکو ئەوەی بیەوێ دیقمان پێ بکات، ئا لەو کاتەدا، زەنگی وشیارکردنەوەی کاتژمێرەکەی تەنیشتم کەوتە زرەزڕ، زەندەقم چوو بە ڕاچڵەکینەوە لە خەو ڕابووم.

تۆ بڵێی کەسێك هەبێ لە نێوتان بتوانێ مانایەکی ڕوون و شیکردنەوەیەکی ئەم خەونەم بۆ بکات؟

هەموو بێدەنگ بوون، تەنها پیرەنووسەرێك نەبێ گوتی:

- گەر مرۆڤ دوور بکەوێتەوە لەو ڕێبازەی کە لە پێناوی ئەوەدا خوڵقاوە، هەموو ئەو مانا مرۆڤایەتییەش لە بیر بکات کە هەیەتی، پشـــیلە لەو بەختیارتر دەبێت، ئیدی بەخیلی بە شێوازی ژیانیشی دەبات.

بەم شێوەیە کۆتایی بە وتەکانی هێنا و گوتی:

- ئەم خەونەت دەکەم بە چیرۆکێك لە کتێبێکدا چاپی دەکەم!

- ئایا هێندە سەرسام بوویت بە خەونەکە؟

بەڵکو دەمـــەوێ هەموو خەڵکی بیخوێننەوە، تاکـــو یەکێکیان غیرەت بیگـــرێ و لە بازنەکەی دەرچێت، ئەوانی تریش هان بدات بۆ دەرچوون لەو بازنانەی کە بەدەست خۆیان وێنەیان کێشاوە!

# ڕۆمانی وەرگێڕراو

هەرچۆنێك بوو لەنووســـینی رۆمانەکە بوومەوە، سێ مانگی رەبەق بە شـــەو و ڕۆژ کارم تێدا کرد، ئەوەی دیارو ئاشـــکرایە مرۆڤ هەمیشە ستایشـــی خۆی دەکات، ئێمەی نووسەرانیش هەروایەن، تەنانەت منیش خۆم بەخۆم دەڵێم "ڕۆمانێکی ناوازەیە " وەلێ لەبەر چاوی خەڵك شـــەرم لەوە دەکەم، لاپەڕەکانی ڕۆمانە کۆنەکەم کۆکردەوە و ڕووم لە ڕۆژنامەیەك کرد تاکو بڵاوی بکەنەوە...لەوێ پێیان وتم:

-- ڕۆمانی خۆماڵی بڵاو ناکەینەوە.

--- بەڵام ئێوە هێشتا نەتان خوێندۆتەوە.

-- بەچی دەچێ، گەر خوێنەران کەیفیان بە ڕۆمانی خۆماڵی نەیەتەوە و نەیخوێننەوە!!!!

ڕووم لەیەکێك لەدەزگاکانی بڵاو کردنەوە کرد و رۆمانەکەم پیشانیان دا وتیان.

-- ڕۆمانی وەرگێرراو نەبێ بڵاوی ناکەینەوە.

ڕووم لـــە خانەیەکی تری بڵاو کردنەوە کرد و ڕۆمانەکەم پیشـــان دان،

ئەوانیش هەمان وەڵامیان دامەوە.
-- گـــەر رۆمانی وەرگێڕدراوت هەیـــە بیهێنە، ڕۆمانی خۆماڵی زۆر بەئاسانی نافرۆشرێت.
ســـەیرە،وێ دەچێت هەموو خانەکانی بڵاوکردنەوە لەســـەر هەمان وەڵام رێککەوتبن.
ســـێ مانـــگان شـــەو و رۆژ هەوڵمدا بـــۆ ئـــەوەی ڕۆمانێکی بەپێز بنووسمەوە،کەچی ئەوانیش هەر لەخۆیان نەگرت بیخوێننەوە، ڕۆمانەکەم وەك منداڵێکی بیژۆکی لێهات کە لەبەردەم مزگەوتەکان فڕێ درابێت.
شـــتێك بە خەیاڵمدا هـــات، زۆربەی هاوڕێکانم لە زمانی فەرەنســـی وئەڵمانی و ئینگلیزی و ئیتاڵیەوە بابەتەکانیان وەردەگێڕن،پاشان هەڵدەسن بە گۆڕینی "جۆنسن " بە "ئەحمەد"و "مارتا" بە" فاتیمە " و لە دوایشدا ناوی خۆیان لەســـەر دەنوسن و ئیدی ئەم کارە ئەدەبیە دەبێتە بەرهەمی خۆیان و دواتر دەینێرن بۆ ڕۆژنامە و گۆڤارەکان...
باشە من بۆچی پێچەوانەی ئەو کارە نەکەم؟؟؟
دانیشتم ڕۆمانەکەم لەبەر دەست بوو، هەموو ناوە تورکیەکانم گۆڕی بە هاو شێوەکانی بۆ ئەمریکی، دوای ئەوە نەخشەی "نیۆیۆرك " م برد ناوی و ناوچە تورکیەکانم گۆڕی بە "نیۆیۆرکی " لە دوایشدا رۆڵی نووسەری ڕۆمانەکـــە هاتە گۆڕین نـــاوی "مارك ئۆبرایـــن " گونجاو وانییە؟؟
ڕۆمانەکەم نایە بن هەنگڵم و ڕووم لە سەرنووسەری ئەو ڕۆژنامەیە کرد کە جاری یەکەم ورەی ڕووخاندم، ڕۆمانە نوێیەکەم نیشانی داو پێم وت:
ڕۆمانێکی " مارك ئۆبراین م" وەرگێڕاوە؟
-- زۆر ناوازەیە بەڵام مارك ئۆبراین کێیە؟
-- های نایناسن؟ ئەمە شیاوە...هەیهو هەیهوو ئەم نووسەرە بەناوبانگە

"مارك ئۆبرایــــن "...بەرهەمەكانی وەرگێڕدراوەتە ســـەر هەموو زمانە جیهانییەكان، بە پێویستیان نەزانی هەر بیشی خوێننەوە، لەپاش ئەوەی لە قازانج و لایەنە ئابوورییەكەی كۆڵینەوە و پێمیان وت:
- دەتوانی كورتەیەك لە بارەی ڕۆمانەكە و نووسەرەكەیمان بۆ بنووسی؟؟
پێنووسەكەم گرتە دەستم و ئەم پەرەگرافانەم نووسی:
ڕۆمانی "struggle for life""ململانێ لەپێناوی ژیاندا " ڕۆمانێكی بەنرخە و هێندەی نەمابوو ئەمریكا سەرو بن بكات گەر لەشوێنی خۆی ببزوایە، ڕێژەی فرۆشتنی دەگەیشە نزیكەی چوار ملیۆن دانە، سەرباری ئەوەی وەرگێڕدراوە بۆ سەر هەموو زمانەكانی دونیا، ئەوەتا منیش وەری دەگێرمە سەر زمانی توركی.
بەڵام "مارك ئۆبرا"ین mark obrien كێ یە؟
هەروەها كەوتمە ڕێكخســـتن و ڕیزكردنی هەنـــدێ پەرەگراف دەربارەی ڕۆماننووس "مارك ئۆبراین" ئەفەندی بەم شێوەیەی خوارەوە:
بچووكترین كوڕی جوتیارێكی خەڵكی "ڤلادلڤیا" یە كە خاوەنی هەژدە كوڕە، باوكی بەئاواتەوە بوو "مارك " ی كوڕی ببێت بە "قەشەیەكی ئاینی "، بەڵام كە تەمەنی گەیشتە چواردە ساڵان و بە هۆی ئەوەی شەڕی بە مامۆستا ئافرەتەكە فرۆشت و دەرزی ئاژنیبوو بە لاڕانیا لە قوتابخانەی لاهوت" دەركرا لەبەرامبەریشـــدا زیرەكی و بلیمەتیەكەی لە ئاســـتێكی بەرزدابوو. بەم جۆرە ژیاننامەكەیم نوسیەوە، هەروەكو گەورە نووسەرانی ئەمریكا.. لە پیشەی ڕاوەماسی كاری كردووە، لە قاچاغچێتی، دواتر لەبواری گەڕان بەدوای زێڕدا كاری دەكرد....
هەروەكو ئاگاداری چیرۆكەكەین. كە تەمەنی گەیشتە چل ساڵی، یەكەم چیرۆكی نووسی و ناردی بۆ گۆڤاری "let us kiss"تیایدا لاوازی

و سادەیی زمانەوانی لە چیرۆکەکەی بەدی دەکرا، بەکورتی دەتوانین ئەم چیرۆکەی بە گومڕاو بەبێ مانا حسێب بکەین.
ئەوەی لێرەدا مەبەستمە بیڵێم: بەڕێزان خاوەنی خانەی بڵاوکردنەوەکان،لایان وابوو بەردەوام بوون لە وەرگێڕان لەبەرژەوەندی ڕۆمانی خۆماڵییە.
بەمجۆرە شـــوێنم دەکەوتن و دەیانگـــوت: تکایە ڕۆمانێکی ئەم "مارك ئۆبراین"ە بۆ ئێمەش وەرگێڕە....
بۆیە منیش هەژدە ڕۆمانی "مارك ئۆبراین"م وەرگێڕا و بەردەوامیش دەبم لە وەرگێڕان تا لە ژیاندا مابم و نووسەر "مارك" یش لە ژیاندا بمێنێ.
جگـــە لە کتێبەکانی "مارك" بیرەوەرییەکانی "جـــاك لاممار" ئەو پیاوە پۆلیسە نهێنییە بەناوبانگەشم وەرگێڕا!! دڵنیام دەیناسن!...
بیرەوەرییەکانی ئەم دەست و ئەو دەست دەکات، بەڵێ شەش کتێبم وەرگێڕا، لەم ڕۆژانەی دوایشـــدا هەستام بەهەندێ پەرە پێدان بەکارەکەم و کەوتمە وەرگێڕان لە زمانی هندیەوە. تەنانەت لە چینییەوە وەرم گێڕا، خوێنەرانی ئازیـــز بڕوا بکەن لە ٪٩٩ی ئـــەو ڕۆمان و چیرۆکانەی لە ڕۆژنامە و گۆڤارە تورکیەکاندا لکێندراون (واتە خۆماڵین و ناوی نووسەری بیانی بۆ دانراوە ) ناوەکان و ناوی ناوچە بیانییەکانیش لە کارە وەرگێڕدراوەکان لەبەرهەمـــی خۆماڵی بترازێن هیچی تر نین، لەگەڵ ئەم ڕەوشەشـــدا ڕۆژێك دێت توێژەرانی پسپۆڕ لە بواری ئەدەبی ئەمریکی ناچار دەبن کە فێری زمانی تورکی و خوێندنەوەی ڕۆمانی تورکی ببن.
هەروەهـــا ئاواتەخوازم ناوم دەرکەوێ و شـــوێنێك لە ئەدەبی ئەمریکی لەمیانەی "مارك ئۆبراین"وە دەستەبەر بکەم.

# گەر ژن بوومایا!

لە کارگەی کوتاڵی (سەلامە) وەکو دەرگاوان دەس بەکاربوو، مووچەکەی هەشتا لیرەیە، بێگومان ئەم برە پارەیە بەشی بژێوی چارەکە مانگێکی پیاوێك ناکات، لێ دەوەستێتە سەر زیرەکی و چاپووکی خۆی، رۆژێ لە رۆژان وەستاکەی تێبینیی چالاکییەکانی دەکات، مووچەکەی بۆ زیاد دەکات، لەو جۆرە پیاوانە نییە، کە دەرگاوانی شـــیاوی ئەو بێت، وەلێ دونیا ئەمرۆ لنگەوقووچ بووە، کەسێك لەبەر دەرگایە لایەق بە دەرگاوانی نییە! شـــەو و رۆژگار دەخاتە سەر یەك تاکو وەستا مووچەیەکی باشی بداتێ، ئاە گەر دەیتوانی پاسەوانی شەویشی بکردایا، پاسەوانی شەوانە دووسەد لیرە وەردەگرێت و کاری پاسەوانی ئاسانترە لە کارەکەی خۆی. کاتێك مرۆڤ بەهێز و تواناوە داوای شتێك بکات، هەر دەستی دەکەوێت. رۆژێکیان وەستا ناردی بە دوایا: - من دڵخۆشم بە کارەکەت. - سوپاس، خوا تەمەن درێژت بکات. - ژنت هێناوە؟ بە شـــەرمەوە وەڵامی دایەوە وەکو ئەوەی تاوانێکی کرد بێت: - بەڵێ. دوایش دانی پیادانا، ســـەری دانەواند: دوو منداڵیشم هەیە گەورەم. حاڵەتەکەی کاری لە وەستا کرد،

دوایی تووڕە بوو: - ئێ. باشـــە چۆن دەژین؟ - بەکولەمەرگی گەورەم. - چاکەیەکت لەگەڵدا دەکەم، دەتوانی کاری دەرگاوانی و پاســـەوانیی شەوانیش وێکڕا بکەیت؟ - بێگومان گەورەم. - بە ڕۆژەوە شەش کاتژمێر دەرگاوانی دەکەیت و هەشـــت کاتژمێر پاســـەوانی شەویشی بخە سەر، دەکاتە چواردە کاتژمێر، دە کاتژمێرت بەدەســـتەوە دەمێنێت، ئایا ئەمە باشـــە؟ - سوپاس گەورەم. - مانگی ســـی لیرەت دەدەمێ، بەرامبەر کاری پاسەوانییەکەت. - هەرخۆشبی گەورەم. کاری پاسەوانییەکەشی وەرگرت، پاسەوانەکەی پێشـــوو دوو سەد لیرەی وەرگرت، لەبەر ئەوەی خەوی گران بوو، لە کارەکەی ترۆ کرا، بە ڕۆژ لەبەر دەرگا دەوەستێ و بە شەویش پاسەوانیی کارگە دەکات، مووچەی مانگانەکەی بووە سەد و بیست لیرە. وردبین بوو لە کارەکەی، زرنگ بوو، وەستاکەیشی خۆ کەر نییە. ڕۆژێك دێت دڵسۆزی ماندوو بوونەکانی دەبینێت، دواتر ڕزگاری دەکات لە خەمی بژێوی، بۆ نموونە گەر بوو بە نووســـەری کارگەکە، چاکترە بۆی، نووســـەر سێ سەد لیرە وەردەگرێت. کاتێك مرۆڤ بەهێز و تواناوە داوای شـــتێك بکات، هەر دەستی دەکەوێت. ڕۆژێکیان وەستا داوای کـــرد: - مـــن لە تۆ و لەجۆری کارکردنت دڵخۆشـــم، دەمەوێ دووبارە پاداشتت بدەمێ، تۆ لە پاسەوانییەکەتدا بەبێ هیچ کارێك هەر لە چاوەڕوانیدای، ئایا کاری نووسەریش دەکەیت؟ - شەست لیرە دەخەمە سەر مووچەکەت. هەندێك بیری کردەوە، سەد و حەفتا لیرە وەردەگرێ. بە وەســـتاکەی وت: - خوا تەمەن درێـــژت بکات، بەگم. لەبەر ئەوەی جگەرەی دەکێشا نووسەرەکە لەسەر کارەکەی لابردرا، چاو قاوەشی زۆر دەخواردەوە و کاتی بەدەســـتەوە نەدەما بۆ کار کردن. بوو بە نووسەریش لە کارگەکە، بە ڕۆژەوە دەرگاوان و بە شـــەویش لەبەردەم ئامێری چاپ

دادەنیشێ و لە هەمان کاتدا پاسەوانییەکەیش دەکات. باش کار دەکات، وەستاش حەیوان نییە، تێبینیی هیمەتی بەرزی دەکا و پاداشتی دەداتێ. سندوقدارەکەی کارگە مانگانە چوار سەد لیرە مووچە وەردەگرێت، ئای گـــەر دەیتوانی ببێتە ئەمینداری ســـندوقیش. کاتێك مرۆڤ بەهێز و تواناوە داوای شـــتێك بکات، هەر دەستی دەکەوێت. ڕۆژێکیان وەستا لە دووی نارد: - دەزانم ســـەد و حەفتا لیـــرە بۆ ئەم ڕۆژگارە زۆر کەمە، بۆیە دەمەوێ مووچەکەت زیاد بکەم. - سوپاس گەورەم. - مەزندە دەکەم کاتت هەیە؟ لەبری ئەوەی دانیشـــیت لەماڵەوە، ژمێریاریی کارگەت پێ دەســـپێرم. - ئەویش دەکەم گەورەم. - چاکە، چل و پێنج لیرەی تر دەخەمە ســـەر مووچەکەت. سندوقداری پێشـــوو زوو زوو هەڵدەهات و سوعبەتی زۆری دەکرد، بۆیە لە کارەکەی دەرکرا. ئێستا دووسەد و پانزە دەچێتە بەرکییەوە، بە ڕۆژ شەش کاتژمێر کار دەکات، هەشت کاتژمێر بەشەو پاسەوانیی کارگە دەکا، نامە و فۆرمەکان دەنووسێت و کاتێکیش دەچێتـــەوە ماڵ وردبینی و ژمێریاریـــی کارگەکەش دەکات. زۆر کار دەکات، گەلێ وشیارە لە کارەکەی، هەوڵدەدات بەرهەم زۆر بهێنێتەبەر. ئێســـتاش چاوی بڕیوەتە شوێنی گەنجینەدار، چوار سەد و پەنجا لیرە وەردەگرێـــت. کاتێك مرۆڤ بەهێز و تواناوە داوای شـــتێك بکات، هەر دەستی دەکەوێت. وەســـتا بانگی کرد: - دەمەوێ جارێکی تر خەڵاتت بکـــەم، چی دەڵێی بتکەم بە گەنجینەدار؟ - ئەمە لوتفە لە جەنابتانەوە گەورەم. - ســـێ و پێنج لیرە لە مووچەکەت زیـــاد دەکەم، یاڵڵا. بڕۆ گەنجینەکە وەرگـــرە. گەنجینەدار دەرکرا کرا، لەبەر ئەوەی لە زۆربەی کاتەکاندا هۆشی لای خۆی نەبوو، کەلوپەکانی دەناردەوە بۆ ماڵی خۆیان لە جیاتی بێنێرێ بۆ گەنجینە. شـــەو و رۆژ کار دەکات، بەبێ بێزاری

و بێ وەڕس بوون، بێگومان وەستا بارگیر نییە، ڕۆژێك دێت توانایی و ماندوو بوونی دەبینێت. ئەمەش بە ڕاســتی ڕوویدا.. ڕۆژێکیان وەستا بانگی کرد و وتی: - سوپاست دەکەم، من زۆر دڵخۆشم بەتۆ. ئەوی کار بکات بەرهەم دەهێنێت. دەرگاوانی کارێکی شیاو نییە بۆ تۆ، سەرباری کارەکانی پێشــوت بەبەڕێوەبەر دادەمەزرێنم؟! - بەڕێوەبەر؟! واقی زۆر وڕمــا، ماوەیەکە چاوی بڕیوەتە ئەم پلەیە. بە ڕاســتی کاتێك مرۆڤ بەهێز و تواناوە داوای شتێك بکات، هەر دەستی دەکەوێت. - نەوەت لیرە دەخەمە ســەر مووچەکەت. لەبەر ئەوەی وازی لە دەرگاوانی هێنابوو، هەشــتا لیرە لە موچەکەی بڕا، وەلێ لە بەرامبەردا بوو بە بەڕێوەبەر، نەوەت لیرە لە مووچەکەی زیاد کرا، ئێســتا دوو ســەد و شەست لیرە دەچێتە گیرفانیەوە. بەڕێوەبەری پێشــوو لەســەر کارەکەی لابرا، لەبەر ئەوەی هەوڵیدا پەلاماری ئەو کچە تایپیســتە بدات، کە لەسەر ئامێری تایپەکەی وەستا کار دەکات. لە کارگەکەدا چل کرێکار و دوو وەستا هەن و بیست ئامێریش، ناتوانێت وەکو کرێکار کار بکات، نەبادا وەکو وەستاش، ناشتوانێت جێگەی ئامێرەکان بگرێتەوە. کەس نەما لە بەشی کارگێڕی غەیری ئەو و کچە تایپیســتەکە نەبێت، کە لەســەر ئامێری تایپەکەی لای وەســتا کاری دەکرد. ئەوانی تر لەسەر کار دەرکران. لە کاتی دەس بەتاڵیدا، گفتوگۆی لەگەڵ کچە تایپیستەکەدا دەکرد و بە شان و باڵی وەستاکەیدا هەڵدەدا: - خوا لێی ڕازی بێت پیاوێکی چاکە، بە دەرگاوانی و بە هەشتا لیرە هاتمە نێو کارگەوە، بووم بە پاسەوانیش و موچەکەم بوو بەسەد و دە لیرە، دواییش کردمی بە نووسەر بەمووچەی سەد و حەفتا لیرە، دواتر بە ئەمینداری گەنجینە و مووچەکەم بوو بەدوو سەد و پانزە لیرە، ئێستاش بەڕێوەبەر و بە دووسەد شەست لیرە. کچەکەش کەوتە باسی

چاکییەکانی وەستا: - بەچل لیرە و بەخزمەتگوزار هاتمە نێو کارگەوە، دوایی بووم بەجلشۆری وەستا و ماڵەکەیشم خاوێن دەکردەوە، مووچەکەم بوو بەشەســـت لیرە، دواتر بووم بەتایپیێســـت بە مووچەی هەشتا لیرە و دوای ئەوە چێشتم ئامادە دەکرد و کاروباری ناوماڵی وەستام ڕادەپەڕاند، مووچەکەم بوو بەسەد لیرە، بێگومان دوای ئەوەش بووم بە....ی وەستا و مووچەکەم پانزە لیرەی تریش زیادی کرد و بوو بە ســـەد و پانزە لیرە. ڕۆژێکیان بەتایپیێســـتەکەی وت: - زۆر کار دەکەیت و زۆریش ماندوو دەبیت. ئەویش پێی وت: - ئەدی تۆ؟ کەم کاردەکەی؟ مووچەکەت کەم نییە؟ ناتەوێ زیاد بکات؟ ڕووانیە دەموچاوی کچە تایپیێســـتەکە و لە هەردووکیان کەسی تر نەما لە ژوورەکە و بیری لەو هەموو کارانە کردەوە، کە کچە پێی هەڵدەستێ، وتی: - نا. نامەوێت مووچەکەم زیاد بکات، سوپاسی خودا دەکەم، کە کچ نەبووم. ئەوکات دەبوو چم بکردایا. وەستا تۆیشی دەردەکرد و بیست لیرەشی مووچەکەمی زیاد دەکرد، نا. نا. من دڵخۆشم. بە تەواوەتی. گەر ژن بوومایا ئەوکات؟!

# لەبەر خۆمەوە

پێشان کە تووشی یەکێکیان دەبووم لەسەر شەقام یان لە شەمەنەفەر، یاخود لەنێو بازاڕدا، کە لێل خۆیدا قسەی دەکرد پێدەکەنیم، بەڵێ پێدەکەنیم وەلێ لە هەمان کاتدا بەزەییم پیا دەهاتەوە، کە ڕێکەوتی یەکێکیانم دەکرد، وازم لە هەموو کار و کاسبییەك دەهێنا و دەکەوتمە شوێنی و چاودێری جووڵانەوەی دەستەکانیم دەکرد، کاتێ بەدەم و بەچاو ئاماژەی بۆ شتێك دەکرد، وەك ئەوەی لەبەرامبەر کەسێکدا دانیشتبێت ولێلیا بدوێ وابوو، ئەوشتەی پتر سەرنجی ڕادەکێشام جووڵەی هەردوو لێوی بوو وەك ئەوەی پرتەوبۆڵە و گازندە لە شتێك بکا. هەندێ جاریش پێدەکەنی. لەناکاو پێکەنین دەبوو بە تووڕەیییەکی توند و تیژ.. هەنگاوی خێرای دەنایەوە بۆ دووبارە ئارام بوونەوە. بەڵێ بەو بەستەزمانانە پێدەکەنیم، وەلێ پێکەنینێکی تاڵ، کێ دەزانێ چی پاڵی پێوە ناون، کە لەگەڵ خۆیاندا بدوێن و دەبێ چ تاڵییەك وای لێکردبن ئەو جموجۆڵە کۆمیدیانە ئەنجام بدەن؟!.. دوێنێ ئێوارە.. کە لە بینای ڕۆژنامەکەوە هاتمە دەرێ تا بڵێی شەکەت و ماندوو بووم، خەوە نوتکە دایگرتبووم، جەستەم خاو و هیلاك بوو، وەك فەرشێکم

لێهاتبوو، کە بە کوتەك خاوێن کرا بێتەوە، بەڵام چۆن ئێوارەیەك؟ لەگەڵ خۆمدا وتم: - با سواری "میکرۆپاس" بم. کەچی کەسێك بە پێچەوانەی راو بۆچوونەکەم پێم دەڵێ: - نا رۆحی من بەم ئێوارە بەهاریە دڵڕفێنە کێ سواری "میکرۆپاس" دەبێت! بۆچی دوو لیرەش کرێ دەدەی؟ زانیم چی لە ناخمدا دەخولێتەوە و کێ بوو لەگەڵمدا دەدوا، بۆیە ئاوڕێکم لە دەورووبەری خۆم دایەوە تا بزانم کەس چاوی لێم نییە؟ ســـوپاس بۆ خوا کەس نییە... - ئاوها لەگەڵ خۆمدا وتم: چاکترین شت سواربوونی (پاس)ە. - (پاس) ئێســـتا قەرەباڵغە، ئایا ئەوە نازانی؟ دەی بە پێی خۆت بڕۆ. - بەڵێ تۆ لەسەر هەقی! ڕۆژەکەی خۆش و دڵگیرە. - ئەدی چۆن. ئەدی چۆن... بڕوانە خەڵکی چۆن پیاســـە دەکـــەن و رادەبوێرن. پێدەکەنن، ژنێك لەگەڵ ئەمدا و ئافرەتێك باوەشی لەو داوە، تۆش وەکو کەر هەر لە بەیانییەوە تاکو ئێوارە و لە شەویشەوە تاکو سپێدە لە بەرامبەر کۆمەڵێ کاغەزی سپی بیر دەکەیتەوە و تێدەفکری و دەنووسی و دەیدڕێنی دەیشێوێنی و هەموو ئامانج و خەمت ئەوەیە خەندە بخەیتە سەر لێوی خوێنەرانی بابەتەکانت.. تەماشاکە چۆن پێدەکەنن و رادەبوێرن و دڵخۆشن. - بەڵێ لەوەیان لەسەر هەقی ئەوەی لە دنیادا ڕوودەدات، نە خێری هەیە بۆ من و نە سوود.

تـــۆ مرۆڤ نیت؟ ولاغ نازانی هەموو ژیانت چەند رۆژێکە...؟ بچۆ بۆ سینەما. نمایشێکی شانۆگەری ببینە...

لەم کاتەدا یەکێك لە دوامەوە هاواری کرد: - هێی!.. گەلحۆ.. کاتێك ڕێ دەکەیت تەماشـــای پاش و پێشی خۆت بکە، خەریك بوو بتشێلم، دواییش لەســـەر من بە مرۆڤ حیســـابت دەکەن و دواجار لێپرسینەوەشم لەگەڵ دەکەن... - ئاوڕم دایەوە بینیم ئەو کەســـەی قیڕاندی بەســـەرما لە پشت سوکانی ئۆتومبێلێکی سووری کەشخە دانیشتووە و ئافرەتێك لە تەنیشتییەوە

خەریکە لە پێکەنینا دەتەقێ. - هەبێت و نەبێ ئەقڵی لەدەستداوە، نابینی چۆن پرتە و بۆڵەی دێ و هەردوو دەستی دەجووڵێنێ؟ ئوتومبێلەکە بە خێرایی دای بە تەنیشتما و قسەی بۆ خۆشەویستەکەی دەکرد. - ئەو گوێدرێژەت بینی کە جلکی مرۆڤی لەبەر کردبوو و چۆن لە پشتی سوکانەکەوە دانیشتبوو و کەسێکی تریش وەك مانگایەکی ئاوسی سك شەش مانگی لە تەنیشتییەوە دانیشتبوو و چۆن جنێوی دەدا!؟ تۆش بێ وچان لەسەر دانیشتنەکانت لە پشت کۆمەڵێ کاغەزەوە بەردەوام بە، هەموو خەمت ئەم نووسینانە بێت؟؟ - نا نا، نا هێندە غەدرم لێ مەکە!. هێندە خۆشباوەڕ و ساویلکە نیم.. منیش هەروەها دەزانم. - چی دەزانی؟ قسەی قۆڕ!. کار دەکەی و ئیش دەکەی تا ڕۆژێك دێت پشوویەك دەدەی و دەڵێی: لە ڕاستیدا مــن لە گەمژە دەگمەنەکانم لەم دونیایەدا! - هەی هوو، تۆ بەم شێوەیە لەگەڵما دەدوێی، بەڵام بەبێ ئیش و کار چیم لەدەست دێ بیکەم؟ خاوەن خانوو داوای کرێم لێدەکات، ئەم ورگە زلەی منیش پێویستی بە خواردنە، هەروەها، لانی کەم دووساڵ جارێك پێویستیم بەجلوبەرگ کڕینە. - هیچ ڕێگەچارەیەکی تر نییە بۆ ئەو شتە؟ تەماشای دەوروبەرت بکە؟ بەنێو حەشامەتێکی خەڵکدا گوزەرم دەکرد، یەکێك گوتی: - هۆششششش... کەرە. کەچی ئافرەتەکەی تەنیشتی وتی: لێی گەڕێ بەستەزمانە لەوانەیە شێتۆکە بێت، تەماشای بکە چۆن لەگەڵ خۆیدا پرتەوبۆڵە دەکات. - ئەرێ کرێی قسەکانت وەرگرت؟ ئەمە شیاوە.. نەختێك داچەمەوە. مەترسە ملت ناشکێت. هەموو ئەوانەی تۆ دەیکەی دانانی پلەو پایەیەکی ساختەیە بۆخۆت، کێ گرنگی بەتۆ دەدات هەی گەمژە؟ چەنی وەکو تۆ بەم دونیایەدا گوزەریان کرد. دەی کەمێك ئاوڕ لە بەرژەوەندی خۆت بدەرەوە!.. - شوورەیی نییە لەپاش ئەم تەمەنەت؟ - کێ عەیبت لێ دەگرێ؟ لەچی؟

کێ عەیب لەکێ دەگرێ؟ ئەم دنیایە گەیشتە پلەیەك ئەو کەسەی دەمرێ، تاقە کەسێکە دەتوانێ ئەوەی ماوە لە شەرەفەکەی رزگاری بکات. بەڵام مەحاڵ و دوورە لەو کەســـەی کە زیندوو بێت. تۆش ئەو پلەیەت بەخۆت نـــەداوە، پلەو پایەی بەناموس و داوێن پاك؟ ئەم نواندنەت لە چی؟ وەك ئـــەوەی هەرگیز درۆت نەکردبێت. - هەندێ جار درۆ لەگەڵ باوکم دەکەم (هەندێ جاریش لەگەڵ منداڵەکاندا). باوکم تەمەنی هەشتا ساڵە، هیچ ئامراز و رێگەچارەیەکم نەدۆزییەوە تاکو خەندە بخەمەسەر لێوانی، لە درۆ زیاتر.. پارەم هەیە، ئیشەکەم باشە، هەندێ پارەم لە بانکە، بەم شێوەیە درۆ لەگەڵ باوکم دەکەم، تاکو خۆشی بخەمە دڵییەوە. - درۆ هەر درۆیە گەر یەکێ بێت یاخود هەزار، بۆیە لە سەرتە ئاراستەی مەسەلەکە بگۆڕی... - یاڵڵا دوورکەوە لێرە!. تووشی چورتمێکم مەکە. - تۆ لەو ئاژەڵانەی کە ئاسەواریشتان نەماوە، لە پاشـــماوەکانی چەرخی بەردینن. - تۆ ئاژەڵی، تۆ کەری هەی ســـووك و چرووك!. باڵبەستیان کردم و کەوتنە پەلکێش کردنم بۆ بنکەی پۆلیس و لەوێش پیاوێك کە نامناســـی ئاماژەی بۆ من کرد و بەئەفســـەرەکەی وت: - جنێوی پێدام و لەبەر چاوی هەموو خەڵك سووك و ریسوای کردم، شاهێدیشم هەیە لەسەر ئەوە. - چ جنێوێکی پێت دا؟ - پێمی وت: تۆ ســـووك و هیچ و پووچی، بەدخو و نامەرد. - بەم وشـــانە جنێوت پێدا؟.. - نەخێر!. جنێوم بەخۆم دا. کە بەسەر شەقامەکەدا تێدەپەڕیم لەگەڵ خۆمدا قسەم دەکرد. - تۆ شێتی؟ بە شەرمەزارییەوە سەرم داخســـت و وەڵامم نەدایەوە. لەو رۆژەوە ئەوەندە پەلکێشم دەکەن بۆ بنکەی پۆلیس (وای لێهاتووە پیاوانی پۆلیســـیش دەمناســـن). - ئۆف ف ف هاوڕێکەشمان هاتەوە.

دایانە قاقای پێکەنین.

# مەچۆ بۆ گۆڕەپانی پێشوازی!

سێ سوار بۆ گوندی (ئانچیك) هاتن.. عەریفێکی ژەندرمە لە پێشەوە و دوو ژەندرمەش لە دواوەی بوون.. هەردوو ژەندرمەکە، شانبەشانی یەك لەسەر ئەسپەکانیانەوە بەدەم قسەی خۆش و پێکەنینەوە ئەسپەکانیان دەئاژوو. لێ روخساری عەریفەکە گرژ و مۆن بوو، لە شێوە ئیمپراتۆری ژیاری (ئاغرار) دەچێ، هەرکە گەیشتە دەروازەی ئاوایی سوغڵمەیەکی لە ئەسپەکەیدا و تاوێکی پێدا بەرەو ئاوایی، ئەو منداڵانەی لەوێ گەمەیان دەکرد لە ترسان بڵاوەیان لێکرد و هەریەك بەلایەکدا هەڵاتن، منداڵێکی خرپن نەبێ بەرەو قاوەخانەکە ملی نا، سکی وەکو مەشکە دەهات و دەچوو، وەك ئەوەی هەمانەی لەسەر سکی دانابێ، لەگەڵ چوونەژوورەوەی بۆ نێو قاوەخانەکە بەسەر ئامادەبوواندا قیڕاندی: قۆمیسەر بەڕێوەیە.. قۆمیسەر واهات...

هەموو بێدەنگ چاویان لەدەرگاکە بڕی تا بزانن کێیە دێت، منداڵە خرپنەکە چووە دەرەوە تا چێژ لە بینینی ژەندرمەو ئەسپەکانیان ببینێ، عەریف و دوو یاوەرەکەی لە بەردەم قاوەخانەکە بارگەیان خست، یەکێك هەرسێ ئەسپەکەی

بە دارێکی نزیك قاوەخانەکە بەســـتەوە، هەرسێکیان چوونە ژوورەوە، بەبێ ئەوەی ئامادەبووان هیچ جووڵەیەك بکەن، چایچییەکە نەبێت دوو هەنگاو چووە پێشەوە لێیان و گوتی:

- فەرموون جەنابی عەریف...

عەریفەکە ئاوڕی لە چایچییەکە نەدایەوە، چاوی بڕییە دانیشتووانی سەر کورســـییە حەســـیرەکان. بەڵام بەهۆی کزی چرای قاوەخانەکە بەبەراورد لەگـــەڵ ڕووناکیی دەرەوە چـــاوی ئامادەبووانی بەچاکی بەدی نەدەکرد، قیچەك بێدەنگ بوو تا لە ناکاو عەریفەکە هاواری کرد:

- ئەمە یاخیبوونە؟!

کەس متەقی نەکرد. عەریفەکە دووبارە هاواری کردەوە:

- پێتان دەڵێم: ئایە ئەمە یاخیبوونە؟!

یەکێك لە ئامادەبووان گوتی:

- ئەستەغفیروڵڵا.

- گەر ئەمە یاخیبوون نییە. ئەســـتەغفیروڵڵا، بۆچی وامات و بێدەنگن؟ کوێخا لەکوێیە؟!

ئەو کەچەڵی سەر کوڕیسەی ناوی لەخۆی ناوە کوێخا لەکوێیە؟

کوێخا وەڵامی دایەوە:

فەرموو جەنابی عەریف.. بەر لە هەموو شتێ فەرموو دانیشە. تەمێکی تاریك بەرچاوی عەریفی گرتبوو، بەرەو مێزی نزیك دەرگای قاوەخانەکە ملی نا. کوێخا هەڵســـتاو هەموو دانیشتووانی نێو قاوەخانەکەش هەستان، کوێخا ئاماژەی بۆ کورسییەك کرد: فەرموو دانیشە ئێمە دەمانەوێ شتێك لە خزمەت جەنابتا بڵێین.. لە کاتی دانشتنیدا عەریفەکە بە دەنگێکی بەرز شیڕاندی:

- دانانیشم. یەڵڵا تێم بگەیەنن. هۆکاری ئەم ئامادەنەبوونە چییە؟! پاشتر هەردوو ژەندرمەکەی تریش دانیشتن. کوێخا چایچییەکەی گاز کرد:
- چایەکی چاك و تازەمان بۆ بێنە (بۆ قۆمیسەر).
ئینجا گوتی: مەرحەبا و دەستی راستی خستە سەر سینگی و بەخێرهاتنی هەردوو ژەندرمەکەیشی کرد. عەریفەکە دووبارە لە کوێخای پرسیەوە:
- ئەمە یاخیبوونە؟
- ئەستەغفیروڵڵا.. ئەم قسەیە چییە جەنابی عەریف؟!
- گەر ئەمە یاخیبوون نییە، بۆ لە گۆڕەپانەکە پێشــوازیتان لیَ نەکردم؟ بۆچی کەس نەهاتە دەرەوە ئەســپەکەم بۆ جڵەو بکا و بیبەســتێتەوە؟؟ لە هەموو هاتنەکانی پێشووم، پاڵەپەستۆو هەڵپەتان دەکرد بۆ پێشوازیم... کەواتە ئەمە یاخیبوونە...
- نابەخوا وا نییە.
- گەر یاخیبوون نییە.. بۆچی ســەرتان بەم شێوەیە بەرز کردووەتەوە؟ ئایا ســەرکردەی ژەندرمە نیم؟ هەموو کاتیَ بە جلی رەسمییەوە نەهاتوومەتە دیدەنیتــان؟! چایچییەکە چایی بۆ عەریفەکە هێنا، وەریگرت و قومێکی چاکی لێدا و گوتی:
- نە چا و نە هیچ شتێکی ئێوە ناخۆم و ناخۆمەوە. سزاتان دەدەم کوێخا...
- فەرموو...
- پێوەندیی تەلەفۆنیم پێتەوە نەکرد؟
- پێوەندیت کرد جەنابی عەریف.
- فێری ئوسوڵی دیموکراسیتانم نەکرد؟
- بەڵیَ، فێرت کردین، گەورەم.
- بە ژەندرمەیا هەواڵم بۆ نەناردی؟

- بەڵێ، هەواڵەکەیان گەیاند گەورەم.
- باشە من فێرت دەکەم کەچی لە تۆ داوا کراوە، تۆش چیت ئەنجامداوە...؟ بۆچـــی ئامادە نەبوون لە گۆڕەپان؟ ها...؟ بۆچی؟ پێتانم نەوت دەبێ لە گۆڕەپان بە سەد پیادەو چل سوارەوە بۆ پێشوازیم ئامادەبن؟ داوام لێتان کرد هاوار بکەن و بڵێن: (بژی دیموکراسییەت) دواییش ئاگادارتانم نەکردەوە، کە دەبێ لەگەڵ خۆتان گایەك و دوو بەران بێنن و بیکەنە قوربانی و لەژێر پێما سەریانبڕن؟؟ هەموو گوندەکانی تر لەسەر و لەسەرچاو، ئێوە بۆ ئامادە نەبوون؟؟
- جەنابی عەریف.. لە جیاتی گایەك پێنج گات بۆ سەردەبڕین، لە جیاتی دوو بەران ملی بیســـتت بۆ بـــۆ لێکدەکەینەوە!بۆ ئەوەی ببنە قوربانی بۆ دیموکراسییەت، بەڵام ئێمە ناچینە گۆڕەپان بۆ پێشوازی..! ئێمە ئامادەین ڕانـــێ مەڕ و بزنت بـــۆ بنێرین. بۆ ئەوەی هەمـوویـــان ببنە قوربانی بۆ دیموکراسییەت..بەڵام توخوا جەنابی عەریف. مەمان ێرە بۆ ئەو گۆڕەپانە.
- کەواتە ئێوە دژی دیموکراسییەتن..؟
- ئەستەغفیروڵڵا. هیچ قسەیەکمان نییە بەرامبەر بە دیموکراسییەت.. لێ ناچین بۆ ئەو گۆڕەپانەی پێشوازی...!
- کەواتە دەڵێی نا.. بۆچی یاخیبوونەتەوە لە ئازادی؟
- ئەستەغفیروڵڵا. هیچ قسەیەکیشمان بەرامبەر بە ئازادی نییە.. ئازادی خۆی ئازادە. بەردەوام سەرمان بۆ ئازادی دانوواندووە. بەڵام جەنابی عەریف. ئێمە ناچین بۆ گۆڕەپانی پێشوازی!
- کوڕە کوێخا.. ئێمە تۆمان کرد بە کوێخای ئەم گوندە، گەر تۆ نەتەوێ بڕۆی بۆ گۆڕەپانی پێشوازی ئەدی چۆن دان بەدیموکراسییەتدا دەنێی؟! دەڵێی ئازادی لەسەر سەر و لەسەر چاوان.. لە کاتێکدا هوتافی بۆ ناکێشن

واتە (بژی ئازادی).
- نا جەنابی عەریف، ئێمە نەمانوتووە هوتاف ناکێشین. تۆ درۆت نەکرد. تۆ بە هەڵەدا چوویت. بەهەڵە لێمان تێگەیشتووی.. ئێمە لەم لایەنەوە مەحاڵ بەکار دەهێنین بۆ ئەو لایەنە. پڕ بە گەروومان هوتاف دەکێشین بۆ نەمریی ئازادی. بەڵانەکینێ لێرەوە یان لە گوندەکەمانەوە، بەس ناڕۆین بۆ گۆڕەپانی پێشوازی، هەر لێرەوە دەڵێین بژی و لێرەوە هوتاف دەکێشین، دونیات بۆ هەراسان دەکەین و کپیشی دەکەینەوە.. بەڵام، ناڕۆین بۆ گۆڕەپان.. هێ...!
کوێخا پاکەتە جگەرەکەی پێشکەش عەریفەکە کرد، جگەرەیەکی لێ دەرهێنا و لە پاش داگیرسانی وتی:
- جگەرە ناکێشم. کوێخا لە ئێستاوە جگەرەی ئێوە ناکێشم.. تاکو هۆکاری نەچوونتان بۆ گۆڕەپانی پێشوازیشی نەکەیتەوە؟
- نا جەنابی عەریف ناچین.. لێرە هوتاف دەکێشین و دەڵێین (بژی)، بەڵام ناڕۆین...
یەکێك لە ئامادەبووان (پیاوێکی بەساڵاچووبوو) وتی:
- کوێخا بۆچی هۆکارەکەی پێ نایێژی..؟ قسان بکە تاکو بزانێت بۆچی بۆ ئەوێ ناچین..
کوێخا وتی:
- گوێ بگرە جەنابی عەریف. گش جارێك کە داوات لێدەکردین، بۆ گۆڕەپانی پێشوازی نەدەچووین؟ بەڵێ بەغاردان دەچووین بۆ گۆڕەپانەکە.. کە داوات دەکرد سەد پیاو لە گۆڕەپان ئامادەبن. گەورە و بچووك ئامادە دەبووین، تاکو شیرەخۆرەکانیش.. داوای بەرانت لێمان دەکرد.. دوو گامێشمان بۆ دەنارد.. بەڵام لەمەولا هیچ نەما.. چاك گوێ بگرە.. پارساڵ بەتەلەفۆن پێوەندیت

پێمانـــەوە کرد. پێمانت وت: (وەرن بۆ گۆڕەپانی پێشـــوازی) بەهەڵەداوان هاتیـــن، ڕێگاوبانمان پڕکرد، تاکو جێگای ئەو حەشـــامەتە نەدەبووەوە لە گۆڕەپانەکە، سەروگوێلاکمانیان بەکوتەك شکاند. ئەوەبوو منیش کەوتمە سەرزەوی، من و ئیبراهیم بەگ (ئالاغوز)..

ئالاغوز پرسی:

- ئەمە چییە کوێخا؟

پێم وت:

- هەی نەبێ ئیبراهیم. لەو کاتەی لە ئامادەبوون لە گۆڕەپان وەستاوینەتەوە ڕەنگە حزبەکان گۆڕابن و هەروەها حکوومەتیش.. حزبێکی تر چووەتە سەر حوکم.

لە پاش ئەوەی تێرمان لە کوشـــتن و بڕین و تێهەڵدان خوارد، لە کۆتاییدا لە ڕاستی مەسەلەکە تێگەیشـــتین: ئەو کەسەی وتاری بۆمان خوێندەوە ئەندامی حزبمان نەبوو.. بەبێ ئەوەی بزانین چەپڵەمان لێدەدا بۆی، ئیدی بەهەڵە داوان و بە زامداری و بە سەروگوێلاك شکاوی و خەڵتانی خوێنەوە گەڕاینـــەوە ئاوایی، هەروەك ئەوەی لە جەنگێکی ســـەخت گەڕابێتینەوە هەموو لەســـەر جێگا نەخۆش کەوتین، لە پاش هەفتەیەك داوات لێکردین ڕووبکەینەوە گۆڕەپان، تاکو پێشـــوازی لە کەســـێکی ئاست بەرز بکەین! دەبێ ئوتومبێلەکەی بەســـەری پەنجەکانتان بەرزکەنەوە بەرەو ئاســـمان.. سەرپاکمان بۆ ئەوێ چووین. لە حەوتساڵیەوە بۆ حەفتا.. هەر گەیشتینە گۆڕەپانەکە و چاومان بە ئوتومبێلەکان کەوت، هێرشـــمان کردە سەری و خستمانە بان شانمان، کەچی ئۆتۆمبێلەکانی ئاگرکوژێنەوە هێرشیان کردە سەرمان. ئاوپڕژێنیان کردین.. گۆڕەپانەکە بووە زۆنگاو، خەریك بوو بخنکێم. لەلایەکی ترەوە (حوسێن دۆ فناك)یش لە شەلاڵێ ئاودا هەڵکێشرابوو، وێڕای

ئەوەش هەر چەپڵەی لێدەدا و هاواری دەکرد بژی.. بژی.. لەلای سێهەمەوە پێمی گوت:

- هەی هاوار مام کوێخا.. هوتاف دەکێشــــم و چەپڵە لێدەدەم. ئاوپرژێنمان دەکەن، لەبەر ئەوەی نە چەپڵەیان بۆ لێدەدەین و نە پێیان دەڵێین بژی.

- کوڕە برام قسەکەت ڕاست نییە. چەپڵە لێدان و هاوار کردن، ئاو پڕژێنی خەڵکی لە پێداویستییەکانی گەمەکەیە لێرە.. کەیف و خۆشیی خۆیان بەئاو پرژاندن دەردەبڕن.. ئایا ئاو نەگەیشتە ناو شار؟ هاووڵاتی ئاوپرژێن دەکەن تا ئەو مەنســــوولانەی لێرە ئامادە دەبن ببینن، بۆ لە ئاومان غەرق دەکەن. بەسەرســـووڕمانەوە لە ئاوەکە قوتار بووین. هێندە نەماینەوە راستییەکانمان بۆ ڕوون بووەوە. هەروەکو جاری یەکەم: ئوتۆمبێلی بەرپرســـی حزبەکەی ترمان بـــەرز کردەوە، لەبەر ئەم هۆیە بوو لە بـــاران پتر لەئاو غەرقمانیان کرد، بە جلی تەڕ و لە سەرمانا هەڵدەلەرزین، گەڕاینەوە ئاوایی، من یەك بەخۆم بەشـــێوەیەکی بەرباد تەڕ ببووم بەڕادەیەك تاکو پانزە رۆژ جلەکانم وشـــك نەبوونەوە. لە پاش دوو هەفتە بـــە تەلەفۆن پێوەندیت پێمانەوە کرد ئەی جەنابی عەریف و پێمانت وت: لە گۆڕەپانی پێشـــوازی کۆببنەوە. ئەمجارەیان گوندییەکان رەتیان کردەوە بڕۆن بۆ گۆڕەپان، منیش لەگەڵیان.. پێیانم وت:

- کوڕە براکانم لە پیاوکوژان چی دەردەچێ.. کوتەکی ژەهراویتان نەخوارد لە حکوومەتەکەی پێشـــوو؟! ئێستا هیچ نەبێ لەلایەن کوڕانی حزبمانەوە دارکاری دەکرێن. خۆ غەریب نین. رۆڵەی حزبمانن، گوندییەکانم کۆکردەوەو چوویـــن بۆ گۆڕەپان، هەر هێندەی پێمان خستەســـەر گۆڕەپانەکە، پێش ئـــەوەی کەس ببینین و گوێمان لە وتەی کـــەس بێت، پۆلیس لە هەموو لایەکەوە هێرشیان هێنایە سەرمان. ئوتومبێلی جێب دەورەی داین، کوتەکی

ژەهراویش سـەروگوێلاکی دەکوتاین، سۆندەی ئاگرکوژێنەوەش ئاوبارانی دەکردین.. ئەڵڵاە.. ئەڵڵاە.. لە چەند چرکە ساتێکدا دووبارە لە ئاویان نوقوم کردین و جەنابی عەریف.. لە دەوروبەرمان بۆمب تەقییەوە (بوم. بوم) دەبێ لە یەکێك لە کارەکانمان بە هەڵەدا چووبێتین..! تاکو ئێستاش نەمانزانی چ هەڵەیەك لێمان روویدا..!

دەڵێن ئەو بۆمبانە فرمێسك ڕێژن. هەموو دامان لە پڕمەی گریان. ئا ئەم ڕەجەبەش، لەلایەك پێدەکەنی و لەلایەکی تریشەوە دەگریا..

بۆمبەکان دەتەقینەوە (بوم..بوم) و سـۆندەکانیش ئاویـان بەتاڵ دەکرد، ئوتومبێلە جێبەکانیش دەخولانەوە (فیڕ فیڕ) و کوتەکیش دەبارییە سەرمان (کوم کوم) و گوندییەکانیش هاوار دەکەن و هوتاف دەکێشن:

- بژی دیموکراسیەت. هەربژی ئازادی..

ئەوسا پێیانم وت:

- ئاوها هوتاف مەکێشـن. ئەم هاوار و هوتاف کێشـانە ڕاگرن. لەوانەیە (حکومەت) گۆڕابێت، لەملاو لەولاوە هەڵهاتین و گەڕاینەوە ئاوایی.

بۆمبە فرمێسك ڕێژەکان باڵیان بەسەرمانا کێشاوە، بۆ چەند ڕۆژێك بەردەوام چاوەکانمان وەکو (کانی) ئەسرینیان دەڕشت، هەر لەبەر ئەم هۆکارانە تکات لێدەکەم جەنابی عەریف. (دەسـتم دامێنت و هانامان بە تۆ) مەمان نێرە بۆ گۆڕەپانی پێشـوازی، لەبەر ئەوەی ناڕۆین. چیت لێمان دەوێ بۆتی جێبەجێ دەکەین: قوربانیت بۆ دەنێرین، لە بەیانییەوە تاکو نیوەشەو لەم گوندە هوتافت بۆ دەکێشین.

"بژی دیموکراسییەت". "هەر بژی ئازادی"، بەڵام جەنابی عەریف ناچین بۆ گۆڕەپان.

# محەمەد خەڵکی شارۆچکەی ئامات

لە ساڵی ١٩٣٧ بووم بە رائیدێکی قیت و قۆز، جانتای سەفەرم ئامادەکرد، خۆم گەیاندە خولی سەربازی، ماڵئاواییم لە ئاوەکانی شار و مانەوەم لە (بێ ئۆغڵو)* کرد. پۆستاڵی درێژ و جلی تایبەتی عەسکەریم لەبەرکرد. لە دووهەمین مانگی دەوام کردنمدا، هەواڵێکی بەپەلەمان بۆ هات، سەرۆکی ئەرکانی هێزی چەکدار سەردانی لیواکەمان دەکات، سەرهەنگەکە گوتی:

- کاتێك سەرۆکی ئەرکان دێت، لەبارەی ئێمە پرسیار لە سەربازەکان دەکا و پرسیاری ناوەکانی ئێمەشیان لێدەکات.

ئەم مەسەلەیەش لە هەموو شوێنێك، لە نێو سوپادا باوە، ئەفسەرەکان دەستیان بە ئەزبەرکردنی ناوی سەربازەکان کرد، سەربازەکانیش بەهەمان شێوە دەستیان کرد بە ئەزبەر کردنی ناوی ئەفسەرەکان بەڕیزبەندی: مولازم، ڕائید، عەقید، عەمید، لیوا و ژمارە تایبەتییەکانیان.

لە ساڵی ڕابردوو لەگەرمەی پشکنیندا، سەرۆکی ئەرکان پرسیاری ناو و ژمارە تایبەتییە کەی خۆی لێکرد، ئینجا ناوی فەرماندەی سریە، فەرماندەی کەتیبە، فەرماندەی لیوا، دواتر فەرماندەی تیپ، سەربازەکەش

وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دایەوە، تەنها ناوی فەرماندەی تیپ نەبێ، سەرۆکی ئەرکان زۆر لێی تووڕە بوو و وتی:
- ئەو سەربازەی ناوی ئەفسەرەکانی نەزانێ، هیچ نازانێ.
دواتر دەستی لە پشکنین هەڵگرت و ڕۆیی.
بە پێی قســـەکانی بەڕێوەبەری ئامار، سەرۆکی ئەرکان گەر ئەفسەرێ ببینێ و پرسیاری ناوی لێ بکات هەرگیز بیری ناچێ و وتی:
- کاتێك مولازم بووم، سەرۆکی ئەرکان ئەوکات فەرماندەی لیوا بوو، ناوی هەموو سەربازەکانی دەزانی.
هەوڵم دەدا ناوی سەربازەکان ئەزبەر بکەم، ناویانم لەسەر دەفتەرێکی بچووك تۆمار کرد بوو، لە بەرامبەر هەر ناوێك، نیشـــانەیەکی جیاکەرەوەی هەر یەکیك لەو سەربازانەم نووسیبوو، دەستم کرد بە ئەزبەرکردن: ئەحمەدە درێژ (ئەسمەرە، کەپووی بچووکە) عەلی مەرت ئۆغڵو (سوور و سپییە، چاوی شینە) لە ماڵ، لە ڕێگاوبان، لە چایخانە، لە هەموو شوێنێك، دەفتەرەکەم بەدەستەوەیە و خەریکی ئەزبەرم و هەموویان لەم دۆخەی مندا دەژیان.
ســـەربازەکان ناوی ئەفسەرەکانیان بەبێ هیچ هەڵەیەك ئەزبەر کرد، تەنها ســـەربازێك نەبێ بەناوی محەمەد خەڵکی شـــارۆچکەی ئامات نەبێ، نەمتوانی هەموو ناوەکانی پێ ئەزبەربکەم. بۆ زانیاریتان ئەم محەمەدە لە گوندەکەی خۆیان دوور نەکەوتبووەوە، تاکو دەفتەری خزمەتگوزاری سوپای وەرگرت، ئینجا هات بۆ ئێرە، تەنانەت گوندەکەی خۆشی ناناسێت، لەبەر ئەوەی شوان بووە و زۆربەی کاتەکانی لە شاخەکان بەسەربردووە.
کوڕێکی دڵساف و چاکە، چاوەکانی ئارامیان دەبەخشی. دەڵێن: فلانە کەس زەبەلاحە؟ ئەمیش زەبەلاحە، درێژیەکەی مەترێك ونەوەت سانتیمەترە، کاتێك ڕەشاشـــەکەی دەخاتە سەر شانی، دەڵێی ڕەشاشی منداڵانەی هەڵگرتووە.

ژمارەی ئەو وشانەی کە دەیانزانێت لە هەزار وشە تێپەڕ ناکات.
وا مەزندە دەکات، کە ئەتاتورك پێغەمبەرە، توانایەکی وای بۆ فێربوون هەیە پێناس ناکرێت، بە ئاسانی فێرنابێت، وەلێ بە ئاسانایش لە بیری ناچێتەوە.
بە چاو بەستینەوە و بە ماوەی (٧) خولەك ڕەشاشەکەی لێك جودا دەکاتەوە و دەیبەستێتەوە.
محەمەدم زۆر خۆش دەویســـت، یاریی بە ڕەشاشەکەی دەکرد، وەك ئەوەی منداڵێك یاریی بە بووکە شووشـــەکەی بکات، ڕەشاشەکە لە نێوان هەردوو دەستیدا ون دەبوو.
زۆرانبازێکی بەناوبانگ هات بـــۆ لیواکەمان، لەگەڵ محەمەد ئاماتی کەوتنە زۆرانبازی، محەمەد لە هونەری زۆرانبازی نەدەزانی، بە ڕوویەکی گەشەوە وەکو دارتێل وەستا، زۆرانبازەکە لەملاوە بۆی چوو، لەولاوە هەڵیدا، ماوەی یەك کاتژمێر نەیتوانی محەمەد بەزەویدا بدا، لە کۆتاییدا بەرامبەر بوون.
هەرچەندێ باســـی محەمەد ئاماتی بکەم، هـــەر کۆتایی نایەت، وەلێ نەمتوانی ناوی ئەفسەرەکانی پێ ئەزبەر بکەم، ناوی نەقیب و فەرماندەکان تێکەڵ و پێکەڵ دەکات.
- ڕۆڵە محەمەد سەرنج بدە. بۆ جاری دووەم، ناوی نەقیب؟
ڕەنگ و ڕووی دەگۆڕا، بیری دەکردەوە و ئینجا دەیگوت:
- محەمەد عەلی.
- نا، محەمەد عەلی یاریدەدەرە.
- هەڵەم کرد گەورەم.
- هەڵە مەکە محەمەد، جارێکی تر لە سەرەتاوە.
ماوەی دوو مانگ، شەو و ڕۆژ هەوڵمدا لەگەڵی، سەرکەوتوو نەبووم.

هەر ڕۆژەی ناوێك، بۆ سـبەینێ لە بیری دەچووەوە، کاتێکیش تووڕە دەبم لێی، چاوەکانی لێك دەنێ و دەڵێ:
- هەڵە دەکەم گەورەم.
پێش پشـکنین بە ڕۆژێك، چەندین کاتژمێر هەوڵمدا لەگەڵیا، هیچ فێر نەبوو، پێیم وت:
- وریابە محەمەد، گەر بێت و لەکاتی پشکنیندا سەرۆکی ئەرکان پرسیارت لێ بکات، گشتمان مۆلەقەدەبین، ئەفسەران و هاوڕێکانیشت و ماندووبوونی دوو مانگیشمان بە فیرۆ دەڕوات، چۆنت پێ باشە وا بکە.
بەڕاستی لێی تووڕە بووم، بۆ ڕۆژی دوایی لیوا لە بەیانییەوە لە ئامادەباشیدا بوو، نەمتوانی تەماشای ڕوخسـاری محەمەد ئاماتی بکەم. سەرۆکی ئەرکان لە ئۆتۆمبێلەکەی دابەزی، لیواکەمان لە بەردەمی نمایشـی کرد، سڵاوی لە سەربازەکان کرد و ڕۆیی، لە بەردەم محەمەد وەستا، ئەوەی لێی دەترسـام ڕوویدا. پێڵاوەکانم تەنگی بە پێیەکانم هەڵچنی بوو، پشتێنەکەم زگمی دەگووشی، لە تەوقی سەرمەوە ئارەقە بە خوڕ دەهاتەخوارێ، تاکو نووکی پێم، نیگایەکی محەمەدم کرد، بەبێ ترس تەماشـای سـەرۆکی ئەرکانی دەکرد، پرسیاری لێکرد:
- ناوت و ژمارەکەت؟
محەمەد بەبێ هەڵە وەڵامی دایەوە:
- سـریەی پێنجەم، کەتیبەی چوارەم، لیوای سـی، تیپی دوو، سەرباز: محەمەد کوڕی حوسـێن، خەڵکی شـارۆچکەی ئامات، لە دایکبووی ١٩٢٢ و ژمارەکەم ٦٢٥.
منیش لە خودا دەپاڕامەوە لە کەسێکی تر غەیری محەمەد پرسیار بکات.
- ناوی نەقیبەکەت؟

- نەقیب عەلی یوسف. بەبێ دوودڵی وتی.
- ناوی یاریدەدەر؟
- عوسمان خدر.
- مولازم؟
- مولازم حەسەن کولتەکین.
- سەرهەنگ؟
- محەمەد یورت سوار.
محەمەد بوو بە تۆپەڵێك ئاگر، پێش ئەوەی سەرۆکی ئەرکان پرسیارەکەی تەواو بکات، وەڵامی دەدایەوە.
- فەرماندەی کەتیبە؟
- عوسمان قۆتمان.
- فەرماندەی لیوا؟
- کامیل یوڵدز.
محەمەد وەڵامی هەموو پرسـیارەکانی دایەوە و هیچ هەڵەیەکی نەکرد، هەروەك ئەوەی لەگەڵ مندا دەیکرد و سەرنجی سەرۆك ئەرکانی بۆخۆی ڕاکێشا.
سەرۆك ئەرکان وتی:
- سوپاستان دەکەم. دەستی هەمووманی گوشی و فەرمانی دا بەفەرماندەی لیوا پشکنینەکەی تەواو بکات.
سواری ئۆتۆمبێلەکەی بوو و ڕۆیشت. لە پاش پشکنین دەستی محەمەدم گرت و پێیم وت:
- ئەمە چییە محەمەد؟
لە شەرما ڕەنگی سوور هەڵگەڕا و چاوی داخست، منیش بەردەوام بووم:

- محەمەد پێم بڵێ: چۆن ئەزبەریانت کرد؟
محەمەد وەڵام ناداتەوە.
- ڕۆڵــە پێم بڵێ، بە دوومانگ نەمتوانی ناوەکانت پێ ئەزبەرکەم، چۆن توانیت بە یەك شەو ئەزبەریان بکەیت؟ سەرت بەرزەوەکە!
بە هەردوو چاوە بێ بەرییەکانی سەرنجێکی دا.
- بڵێ چۆنت ئەزبەر کردن؟ سەرت بەرزەوەکە.
- ئەزبەریانم نەکردووە گەورەم.
- کەواتە چۆن ناسیانت؟
- نەیانم ناسی گەورەم.
- نەیانت ناسی؟! ئەدی چۆن وەڵامت دایەوە؟!
- من هەر لــــە خۆمەوە ناوەکانم دەگوت، تەنها ناوی فەرماندەی تیپ و سەرۆکی ئەرکانم ئەزبەرکرد، ناوەکانی ترم لە خۆمەوە دەگوت.
- ئاخر محەمەد تۆ ناوەکانت هەموو بەڕاستی دەگوت، کەچی لەبەرامبەر من زۆر بیرت دەکردەوە.
- گـــەورەم، لەبەر ئەوە لەبەرامبەر تــۆ لە ناوەکاندا هەڵەم دەکرد،، چونکە تۆ لێرە ڕائیدی، بەڵام لەبەرامبەر ســـەرۆکی ئەرکان ناتوانم تەتەڵە بکەم و هـــەر لە خۆمەوە ناو دەڵێم، چونکە ئەویش وەکو من ناوەکانی ئەزبەر نییە و نایزانێ..

* ناوی گەڕەکێکە لە ئەستەنبوڵ.

# من هەقم چەس!

- پۆلیس...! بیگەنێ.. فریاکەون...!
هاموشـــۆکەران لە هاتوچۆ وەستان، لە هەموو لایەکەوە لەدەوری ئەو پیاوە کۆبوونەوە، کە هاواری دەکرد وداوای یارمەتی دەکرد..
پۆلیسێك لەوێ بوو.. هیچیان هەوڵیان نەدا منجە منجێکش بکەن.. بەڵکو بەنێو قەرەباڵغیەکەیا ڕێیان دەکرد، بەبێ ئەوەی ئاوڕیشـــی لێ بدەنەوە بەردەوام بوون لەڕۆیشتنیان.
- پۆلیس!.. پۆلیس.
شتێکی سەیرە.. پیاوانی پۆلیس کەڕ و کاس بوونە و نابیستن. ئەوە پیاوێکی ئاسایشە لەسەر شوستەکەی بەرامبەر.
- تۆ بلێی گوێی لێ نەبێ؟
پیاوەکە دەستی نایە سەر دەمی و بەشێوەی زوڕنا:
- پۆلیس !.. بیگەنێ !فریاکەون!پۆلیس.
پیاوەکە کەمەربەنـــدی قەرەباڵغییەکەی دەوری خۆی بەزاند و ڕووەو

ئاسایشەکەی سەر شۆستەکەی بەرانبەر ملی نا و پێی وت:
- گەورەم، لوتف دەکەی بێی لەگەڵم؟
- چی بووە؟
- لەوێ لەو قەیسەریە لەهەوڵی ئەوەدان پیاوێك بکوژن.
- من هەقم نییە!
- بۆ؟
- من سەر بەپۆلیسی هاتوچۆم، گەر لەشوێنی ببزوم باری هاتوچۆ دەشێوێت.
کابرا سەر لەنوێ دەستی بەهاوار کردەوە.
- پۆلیس!. فریاد ڕەسێك نییە روحێك رزگاربکا؟ پۆلیس!
ئاسایشێك بەخێرا رێی دەکرد پیاوەکە خۆی پێی گەیاند.
- گـــەورەم!.. تەنها خولەکێك بەیارمەتیت، لەوێ هەوڵدەدەن پیاوێك بکوژن، نایەی؟
- من خۆم تیا هەڵناقورتێنم!ئەم مەســـەلانە پەیوەســـتە بە پۆلیسی هۆبەی دووەوە، من پسپۆڕم لە کاروباری پاسەپۆرت.
کابرا ســـەری لێشێوا، تاوێ بەلای راستدا ڕای دەکرد، تاوێ بەلای چەپدا و بەهەموو توانایەوە هاواری دەکرد:
- پۆلیس!پیاوێك دەکوژن!پۆلیس!.
- دەی !.. ئەوە پۆلیسێکی ترە لەلایەکی ترەوە دێت، رایکرد بۆلای: تکات لێدەکەم وەرە!...لەوێ خەریکە یەکێك دەکوژن!
- من هەقم چەس!.. من پۆلیسم لەوەزارەتی (.....)
قەرەباڵغییەکە بەردەوامە لەزیادبوون. رایکرد بۆلای ئەو پۆلیســـەی مامەڵەی لەگەڵ سەوزە فرۆشەکە دەکرد.

- گەورەم!تکایە خێراکە!.. پیاوێك دەکوژن.
- من خۆمی تیا هەڵناقورتێنم!من لە پۆلیسەکانی شارەوانیم.
پۆلیـــس زۆرن، بەڵام لەبەدبەختـــی ئەم، هیچیـــان پێوەندییان بەم مەسەلەیەوە نییە.
- ئەرێ پۆلیس دەست ناکەوێت؟ پۆلیس!
- ســـوپاس بۆخوا، ئەوە پۆلیســـێکی ترە، بۆ ئـــەوەی نەکەوێتە نێو پرسیارێکی هەڵەوە، بەم شێوەیە پرسیاری لێ کرد و وتی؟
- ببوورە گەورەم، جەنابتان لەکام هۆبەن؟
- لە هۆبەی دوو..
- ئای لەم رێکەوتە چاکە.. لەوێ هەوڵدەدەن پیاوێك بکوژن دەفەرموو با برۆین؟
- من هەقم نییە!راستە من لەهۆبەی دووم، وەلێ لەبەشی نەهێشتنی دزی کاردەکەم.
پیاوەکە بەرەو گۆڕەپانی (مەزنەکان) کەوتەڕێ، قۆڵی یەکەم پۆلیسی گرت، کە رووبەڕووی بووەوە!
- دێیت لەگەڵم، پیاوێك لەوێیە دەیانەوێ بیکوژن.
- من خۆمی تێ هەڵناقورتێنم.
- تۆ لە هۆبەی دوو نیت؟
- من لە هۆبەی دووم، بەڵام لەبەشـــی نەهێشـــتنی قاچاغم، بچۆ پۆلیسێکی نەهێشتنی تاوان بدۆزەرەوە.
گەڕایەوە بۆ شوێنی روودانی تاوانەکە، شەقامەکە جمەی دەهات لە خەڵك، پیاوەکە رێی لە پۆلیسێکی تر گرت!
- لە هۆبەی دووی؟

- بەڵێ !
- سوپاس بۆ یەزدان. گەورەم خێراکە!. هەوڵدەدەن پیاوێك بکوژن.
- لە کوێ؟
- لەوێ
- من هەقم نییە!..
- بۆ؟
- لە ناوچەی من نییە.. من سەر بەناوچەی (سورماجیر)م.
پیاوەکە بە سەرلێشـــێواوییەوە ئاوڕی دایـــەوە و خۆی لە رووبەڕووی پۆلیسێکی تردا بینییەوە:
- بمبەخشە، ئێوە لە هۆبەی دوون؟
- بەڵێ.
- سەر بەم ناوچەیەی؟
- بەڵێ.. چی بووە؟
- براگیان، لەوێ دەیانەوێ پیاوێك بکوژن.
- من هەقم نییە، ئیمڕۆ من مۆڵەتی فەرمیم وەرگرتووە!.
یەکێك لە پیاوە ســـەر لێشێواوەکە نزیك بووەوە و چرپاندیە بن گوێی و پێی وت:
- هەمان شـــت بەسەر مندا هات، بۆیە دەزانم گەڕان بەدوای پۆلیس بەم شێوەیە نابێت، گەر سووری لەسەر گەڕان بەدوای پۆلیس، بچۆ بۆسەر سەکۆی ئەو گۆڕەپانە و هاوار بکە " ئەم حەیا چوونە چییە!..
)
پیاوەکە لەناوەڕاســـتی هێڵی ( میترۆکە ) وەســـتاو دەستی بە هات وهاوار کردن کرد!

- ئـــەم حەیـــا چوونە چییـــە!... کارێکە و قبـــوڵ ناکرێت!.. ئەم قەشمەرجاڕیە چییە!..
پیاوەکە بەردەوام بوو لە قســـەکردن، بەڵام ڕێیان نەدا، چەند کەســـێك لەنـــاو ئاپۆڕەکەی دەوری هاتنە گیانی و گرتیان بە پیلیا و دایانە پێش خۆیان!
- یاڵڵا بۆ بنکەی پۆلیس!..
- ئێوە کێن؟
- ئێمە پۆلیسی شارستانین، پۆلیسی سیاسی.
لـــە هەموو لایەکەوە بوو بەفیتۆ لێدان، یەکەم کەس بەدەنگ شـــاور لێدانەکەوە هات ئەو پۆلیســـە بوو، کە مۆڵەتی فەرمی وەرگرتبوو، دوای ئەو پۆلیســـەکەی ســـەر بەناوچەی (سورماجیر) بوو لەگەڵ بەردەوام بوونی فیکەو شاور لێدان پۆلیسی شارەوانییەکان و پۆلیسی هاتوچۆکەش گەیشتن.
ئەو کەســـەش لەوێ بوو، کە پێش نەختێـــك ئامۆژگاری کرد هاوار بکات، لێی پرسی!
- ئایا تۆش پۆلیسی؟
- من مفەوەزی پۆلیسم.
کـــە پیاوەکەیان دایە پێش خۆیان بۆ بنکـــەی پۆلیس، لەبەردەم ئەو قەیســـەریەوە تێپەڕین، کە شەڕەکەی تیا روویدا، بریندارەکە کەوتبووە سەر زەوییەکە و دەتلایەوە ودەنووزایەوە، پیاوەکە وتی:
- ئای لەو بەدبەختە!
پۆلیسی هاتوچۆکە پرسیاری لێکرد وتی:
- خزمتان دەبێت؟

پیاوەکە وتی:
- نەخێر!هەر ناشی ناسم، من بەناوی مرۆڤایەتیەوە هانام بۆ پۆلیس هێنا.
پۆلیسەکە بە تووڕەییەوە وتی:
- یاڵڵا خێراکە، برینداره‌کە شەقامەکەی لە خوێن لەوتاند، لەپاش ئەوەی رادەستی بنکەی پۆلیست دەکەم، دەگەڕێمەوە سکاڵای سەرپێچی لە دژی تۆمار دەکەم!

# یەکەم و دواهەمین ڕادیۆ

ئەوکاتـــەی من منداڵ بووم، لە هیچ شـــوێنێك ڕادیۆ نەبوو، تەنها لە چایخانەکە نەبێـــت، دواتر ماڵ نەما ڕادیۆی تێدا نەبێت، تەنها ماڵی ئێمە نەبێت.
کاتێك دەستم بەکارکردن کرد، یەکەم ئامانجم ئەوەبوو لەمووچەی یەکەم مانگم ڕادیۆیەك بکڕم، وەلێ نەمتوانی بیسەنم تاکو تەمەنم گەیشتە بیست و هەشت ساڵ.
پێشەکی دووسەد لیرەم لە نرخەکەی دا، پاشەکیەکەیشی مانگانە دەبێ بیدەم، واتە سی لیرە بۆ ماوەی دە مانگ، پارێزگاری لێدەکەم، هێندەش دڵم پێی خۆشە وەکو ئەوەی خۆم ڕادیۆم داهێنابێت.
لەهەموو گفتوگۆکاندا لەگەڵ ئەو کەسانەی دەیاننناسم، یاخود پێمی دەناســێنن سەرەتا دەکەومە وتووێژ، دواتر دێمە سەر قسەکردن لەبارەی ڕادیــۆوە:" مارکەی ڕادیۆکەتان چییە؟ تاســیلی یە. چەند لامپای لەســـەرە"؟. پێنجی هەیە.. ئایا دەنگی ناخۆشی لێوە دەردەچێت؟ ئەو کافرەی من وەکو ڕۆن کار دەکات.. ئایا ئەو شەپۆلە ئەمەریکیەتان هەیە

کە لەهەموو لایەکەوە دەیکێشێت؟.
کەیف و خۆشـــیم وەســـف ناکرێت، بەهەر بیانوویـــەك بێت هاوڕێکانم بانگهێشت دەکەم تاکو رادیۆکەم ببینن، یەکێکیان وتی:
- چیت لەم رادیۆیە کردووە؟ هێڵی گەرمت لەجێگای هێڵی سارد داناوە و هێڵی ساردیش لەجێگای گەرم.
- نا.. چۆن زانیت؟
- دیارە، بیبە بۆ لای وەستا پێش ئەوەی بەیەکجاری لەدەست دەرچێ.
هەروەکـــو رێنمایی کردم، بردم ئەو هەڵەیەی کەکردبووم بۆ وەســـتاکەم گێڕایـــەوە، پێکەنی و وتی: چاکت کرد هێنات، گەر پانزە رۆژی تر ئیشت پێی بکردایا هەموو لامپاکانی دەسوتان.
واقم وڕما، دوێنێ یەکەم قستیم دایەوە.
وەستاکە: بەچل و پێنج لیرە بۆتی چاك دەکەمەوە.
لەپاش ســـێ رۆژ بەچاککراوی بردمەوە، ئەمجارەیان دەنگەکەی هەر لەخۆیـــەوە زیادی دەکرد بەبێ ئەوەی دەس لە دوگمەکەی بدەم، کاتێك دەنگیم کز کرد، خـــۆی رانەدەگرت و بەجۆرێك دەنگی بەرز دەبووەوە شووشەکەی دەلەراندەوە.
متمانەم بەوەســـتاکەی پێشوو نەما، بردم بۆ لای وەستایەکی تر!پێمی وت:
- ئایا پێشتر چاکت کردۆتەوە؟
- بەڵێ.. دوێنێ لەچاککردنەوە هێنامەوە.
- کام ئاژەڵ چاکیکردۆتەوە؟ هەر دووشریتەکەی بەپێچەوانەوە گرێداوە! دەبێ چوار رۆژ لەلای من بمێنێتەوە و کرێکەیشی پەنجا لیرەیە بەرِێژم.
لـــەدوای چوار رۆژ رادیۆکەم بردەوە، ئەمجارەیان لەکاتی ئیشـــکردندا

دەنگی بەکزی دەهات و دەمکردە سەر هەر شەپۆلێك هەر گیزەگیزی دەهات، بردمەوە بۆ هەمان وەستا، خۆی لەوێ نەبوو، دامە شاگردەکەی، وتی: پێشـــتر چاکت کردۆتەوە؟ بەبێ ئەوەی وەڵامـــی بدەمەوە ئەو هەربەردەوام بوو: کام حەیـــوان بۆتی چاککردۆتەوە؟.. دەبێ دوو رۆژ بمێنێتەوە، لامپای دەنگەکانیت بۆ دەگۆڕم، نرخی لامپاکان ســـی و پێنج لیرەیە و کرێی ماندووبوونەکەی منیش دە لیرەیە، لەپاش سێ جار چاککردنەوە، رادیۆکەم بۆ ماوەی دوو کاتژمێر بەچاکی ئیشـــی کرد، دوایی شەپۆلەکان چوونە ناو یەکدیەوە و تێکەڵی یەکتر بوون، مەوجە کورتەکان جیاوازی هەیە لەگەڵ شـــەپۆلە درێژەکان، لە وێســـتگەی ئەنقەرە، پاریس دەدۆزمەوە...!

رادیۆی بەستەزمانم کردە بن هەنگڵم و بردم بۆ لای وەستایەکی تر و پێم وت: بەڕێزم بەر لەوەی رادیۆکە ببینی گوێم لێبگرە، ئەم رادیۆیەم مانگ و نیوێك لەمە و پێش کڕی، زۆر چاك بوو و منیش هەمیشە شانازیم پێوە دەکرد لەبەر ئەوەی بەقسەی هاوڕێیەکی نەفام هەڵخەڵەتام و بردم بۆلای وەستا.

- تێگەیشتم، پێویست بەدرێژدادڕی ناکات، لەوکاتەوە باش ئیش ناکات.

- چۆن زانیت؟!

- بێگومـــان، بازاڕ پڕ بووە لە ئاســـنگەران و دەڵێن ئێمە وەســـتای چاککردنەوەی رادیۆین.

- من تەماحم لە مرۆڤایەتیتانە، تاکو ئێســـتا ســـەد و چل لیرەم داوە لەهەمبـــەر چاککردنەوەی، من کارمەندێکم مووچەم کەمە، گوێ لە ویژدانتان و لە دەنگی رادیۆ پەککەوتووەکەم بگرن.

بەدیقەتەوە رووانییە رادیۆکە و وتی:

- دەیکەمەوە گەنجێکی بیست ساڵان، بەڵام ئێوەش لەسەرتانە شەست لیرە کرێ بدەن.
- باشە هەندێ قرۆشم لەبانکدا هەیە، دەتاندەمێ و هێندەشم بەسە ئێوەش بەڵێنەکانتان جێبەجێ بکەن، بەو شێوەیە چاکی بکەنەوە کە پەیمانتاندا.
- سەرسام دەبی بەکارەکەم ئیتر بۆ لای هیچ وەستایەکی تر ناچیت ئینشائەڵڵا.
-لەپاش ئەم چاککردنەوە مەزنە، شتێکی سەیر و نامۆ روویدا، نەمتوانی لێی تێبگەم، رادیۆکە گۆرانی دەڵێ بەبێ ئەوەی کەس دەستی لێ بدات، کاتێك یاری بەدوگمەکەشی دەکەم کەمێك لەگۆرانی چڕین دەوەستێ، دواتر دەس بەگۆرانی وتن دەکاتەوە، هەندێ جاریش لەنیوەی شەودا، لەدەنگی رادیۆکەم رادەچەڵەکم، بەمیزاجی خۆی گۆرانی دەبێژێت، زۆرجار بەشەوان لەدەنگی کەمانجە بێزار دەبم و لە دەنگی مۆسیقای جازیش لەجێگای خۆم هەڵدەبەزمەوە ـ رادیۆکەم سەربەخۆیی خۆی راگەیاند..! گەڕام و پشکنیم، وەستایەکم بینییەوە کە متمانەی پێبکەم. ئەو کەسەی تاریفی ئەوی بۆم کردم وتی:
- ئەو رادیۆیەی وەستا تێکی بدات کەس ناتوانێت چاکی بکاتەوە، بەڕاستی وەستایە.
وەستاکە پێمی وت:
- کام بێ نامووس چاکی کردۆتەوە؟ پارچەکانی هەموو خزاونەتە سەر یەك و سەرەکانیشی هەموو شل و شاون.
- ئێستا چی دەکەیت؟
- وای لێدەکەم بەچاکی ئیش بکات.

وەستا بەسی لیرە چاکی کردەوە، رادیۆکە دەنگی ناخۆش وهەراسانکاری دەردەبڕی، شەوێك لە شەوان دراوسێکان و پۆلیس هاتن بۆ ماڵمان و وتیان:

- ماڵەکەت دەپشکنین. ئێوە لێرە خەڵکی سەردەبڕن.

بەپێکەنینەوە وتم: برای بەڕێزم کەس سەر نابڕین، ئەوە دەنگی رادیۆکەیە، هەر وەستایەك چاوی بەڕادیۆکە دەکەوت دەتگوت تفیان لەزاری یەکدی کردووە و دەیگوت:

- کام گوێدرێژ چاکی کردۆتەوە؟

- کام بێ ویژدان وای لەم رادیۆیە کردووە؟. لەکۆتاییشدا دەڵێن:

- دیشلییەکەی خوراوە.

- لامپای دیشلیەکەی عەمری درێژی بۆ تۆ بەجێ هێشتووە.

- لامپاکان تێکچوونە دەرزیەکی خاوبوەتەوە و چل یاخود پەنجا لیرەشیان لێم دەستاند کە ئەو شەش سەد لیرەیەی بەگۆشت و نینۆکی خۆم پەیدام کردبوو تەواو بوو کەوتمە بیری ئەوەی چۆن رادیۆکەم لای وەستاکە بهێنمەوە.

بەئاگا هاتمەوە لەوەی کەبیر کردنەوە دە قروش ناهێنێ، زۆر بیرم کردەوە، هیچ رێگەچارەیەکم نەدۆزیەوە بۆ دابینکردنی حەفتا لیرە، لەهەموو ناسیاوەکانم قەرزم کرد و شەرم دەمگرێ جارێکی تر داوایان لێ بکەم، شەش قست لە نرخی رادیۆکەم لەسەر ماوە، رادیۆ فرۆشەکە لەدادگا سکاڵای لەسەرم تۆمارکرد، تاکو دەس بەسەر ماڵ و موڵکەکەمدا بگرن.

تەنها رێگەچارەیەك لە بەردەمما مابێت ئەوەیە رادیۆکەم لە رێگا دەست بەسەرداگرتنەوە (حجز) بفرۆشرێت.

حەفتا لیرەی لێ بدەمەوە وەستاکە و ئەویش دەمێنێتەوە قەرزەکانی لێبدەمەوە، ئینجاش دووهەزار لیرە زیاد دەکەم.
چووم بۆ لای وەستاکە و پێم وت:
- کرێی چاککردنەوەکەیت دەدەمێ، وەلێ دەبێت رادیۆکە بفرۆشیت و کرێکەی خۆتی لێ هەڵگری و ئەوەیش دەمێنێتەوە بمدەیتەوە.
دەزانن چی پێم وت !
- ئەم رادیۆیە قرۆشێك ناهێنێت.
- قرۆشێك ناهێنێت؟ بەشەش سەد و پەنجا لیرە کڕیومە، پتر لە هەزار لیرەم داوە بەکرێی چاککردنەوەی و هێشتا دوو سەد و دە لیرە لە نرخەکەی خۆی ماوە لەسەرم، سێ سەد لیرەش ناکات؟
- نایکات.
- دوو سەدیش ناکات؟
- نایکات.
- باشە سەد؟
- سەدیش ناکات.
- کەواتە بیبە بۆ خۆت لەبەرامبەر چاککردنەوەکەی و منیش هەموو هەوڵەکانم دەخەمە گەڕ تاکو قیستەکانی بدەمەوە، ناخۆم و ناخۆمەوە هەتا رزگارم دەبێ لێی.
نەك هەفتا لیرە.. حەفتا قرۆشیش ناهێنێت.
- چۆن رۆحی من؟
قەپێلغەکەی کردەوە وتی: تەماشاکە.
روانیم، هیچم تێدا نەبینی، تەنانەت پارچە مسێکی دارِزاویش.
وتی: دەسێك لەناوی وەردە و بی پشکنە.

دەستم خستە ناوی و پشکنیم، هیچ لەناوی نەبوو. بۆیە وتم:
-کوانێ ئەو پارچانەی لەناوی بوون؟
-پێم بڵێ، چەند کەس ئەم رادیۆیەی چاککردەوە و ژمارەیان چەند بوو؟
ژماردیانم و وتم:
- پتر لە بیست.
- تۆ مێشکت نییە؟!
- بۆ؟
- بۆ؟ رادیۆیەك بکەوێتە بەردەستی بیست وەستا، هیچی تێدا دەمێنێ؟ هەر وەستایەك سێ یا چوار پارچەی لێ ببات.. تەواو، سوپاسی خوا بکە کەوڵەکەیان بۆت هێشتۆتەوە، تاکو بۆ یادگاری هەڵیگری.
- باشە براکەم، تۆزێ بەزەییت پێما بێتەوە، ئایا ئەو کاتەی هاوردم بۆت بەتاڵ بوو؟
- لە ئامێری بڵند گۆکەی کردنەوە کۆنەکە نەبێ هیچی تری تیا نەبوو، ئەویشم برد.
- ئامێری دەنگ گەورە کردنەوەکەت بردووە و داوای حەفتا لیرەشم لێدەکەیت؟
- ئەدی مەزندەی چی دەکەیت؟ بیست ساڵ لە تەمەنم بەفیڕۆ چوو تاکو فێری ئەم پیشەیە بووم، پێت وایە دەرکردنی ئامێرێك بەبێ ئەوەی تێکبدرێت کارێکی ئاسانە!
قەپێلغە بەتاڵەکەم هەڵگرت و کردمە سەری پیاوەکە تاسەر شانەکانی هەڵمکێشا.. لەپاش ئەم کێشەیە، سێ مانگ لەبەندیخانە پاڵم لێدایەوە جارێکی تر رادیۆ ناکڕم ئەمە یەکەم و دوا رادیۆیە لە ژیانمدا.

## ئەو کتێب و بڵاوکراوانەی لقی کەرکووکی یەکێتی نووسەرانی کورد پاش کۆنفرانسی ئازادی بەچاپی گەیاندوون جگە لە گۆڤاری گزنگ کە بەردەوام مانگانە دەردەچێت

| ز | ناوی کتێب | بابەت | نووسەر | وەرگێڕ | ساڵ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٠٨ | خوێندنەوەی چەند دەقێکی ئەدەبی و فیکری | خوێندنەوە | سامان محەمەد | | ٢٠١٠ |
| ١٠٩ | هەرمێیەکانی فیرعەون | شیعر | ئەحمەدی مەلا | | ٢٠١٠ |
| ١١٠ | تەونێك لە شیعر و وشە | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | مەحمود نەجمەدین | | ٢٠١١ |
| ١١١ | ١ ١ ١ نامەی سۆزداری | تێکستی دڵداری | کۆکردنەوە و ئامادەکردنی: حەمە سەعید زەنگنە | | ٢٠١١ |
| ١١٢ | دانای کوێخا شەوکەت | ڕۆمان | موعتەسەم ساڵەیی | | ٢٠١١ |
| ١١٣ | سەمای روح | کورتە چیرۆك | نەوزاد یوسف کاکەیی | | ٢٠١١ |
| ١١٤ | سلێکوك هۆکلێر عاجباتیی هەشتەم | ڕۆمان | عەبدوڵڵا سەڕاج | | ٢٠١١ |
| ١١٥ | خەزان و شنەی بەیان | شیعر | غازی ڕەشید زەنگنە | | ٢٠١١ |
| ١١٦ | بزووتنەوەی ڕوانگە و شاعیرانی حەفتا و هەشتاکانی هەولێر | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | د.هیمدادی حوسێن | | ٢٠١١ |
| ١١٧ | ئاوابوونی جەستە لە سەفەری دڵدا | شیعر | ستار ئەحمەد عەبدولڕەحمان | | ٢٠١١ |
| ١١٨ | دەرگاکان | کۆچیرۆك | خالید مەجید فەتحوڵڵا | | ٢٠١١ |
| ١١٩ | تەنیا لەبەر مەعاشەکەیە | کورتیلە چیرۆك | بەکر دەروێش | | ٢٠١١ |
| ١٢٠ | گەشەکردنی زمانی منداڵ | زمانی منداڵ | | و: د.ئازاد باخەوان و ناصح محمد | |
| ١٢١ | لە لووتکەی ئەدەبی ئەڵمانەوە | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | عومەر عەلی شەریف | | ٢٠١١ |
| ١٢٢ | وازیەکانی رەشە گۆم | ڕۆمان | کاکە مەم بۆتانی | | ٢٠١١ |
| ١٢٣ | شاری لەغەم ئاوسبوو | ڕۆمان | سالار ئیسماعیل سەمین | | ٢٠١١ |
| ١٢٤ | ململانێ لەگەڵ پرسیاردا | کۆدیدار | دانا عەسکەر | | ٢٠١١ |
| ١٢٥ | ئەو نامانەی بۆ پیرێتی خۆم دەیاننێرم | دەق | سوارە نەجمەدین | | ٢٠١١ |
| ١٢٦ | عامُ الصِّفْرْ | شعر | صباح رەنجدەر | ترجمة: المهندس محمد حسين رسول | ٢٠١١ |
| ١٢٧ | ڕاکشان لە تەنیشت تارمایی نیشتمانەوە | چەند دەقێکی شانۆیی | عەبدوڵا سلێمان (مەشخەڵ) | | ٢٠١١ |
| ١٢٨ | لقاءات تحت أشعة الحروف المشرقة | مجموعة حوارات | سردار زنكنه | | ٢٠١١ |
| ١٢٩ | دزەکان | کۆمەڵە چیرۆك | | ئازاد نەجم | ٢٠١١ |
| ١٣٠ | ڕووبەرێکی ڕەخنەیی | ڕەخنەی ئەدەبی | د. فوئاد ڕەشید | | ٢٠١١ |
| ١٣١ | کتێب | خوێندنەوەی بیست تێکستی هەمەجۆر | جەلیل کاکەوەیس | | ٢٠١١ |
| ١٣٢ | لە سۆاخی عیشقدا | کۆمەڵە چیرۆك | سەلمان شێخ بزێنی | | ٢٠١١ |
| ١٣٣ | عومەر سەیفەدین | لێکۆڵینەوە | | و. لە تورکییەوە: ئەحمەد تاقانە | ٢٠١١ |

| ١٣٤ | مەحوی ناسی | لێکۆڵینەوە | هیمداد شاهین | | ٢٠١١ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٣٥ | بەیداخ | نۆڤڵێت | حەمە کەریم عارف | | ٢٠١١ |
| ١٣٦ | زایەڵەی ئاوەسپی | کۆمەڵە بەرهەم | ئا: بەکر دەروێش | | ٢٠١١ |
| ١٣٧ | بازاڕی ناوخۆیی | ڕۆمان | | و: بورهان ئەحمەد | ٢٠١١ |
| ١٣٨ | ڤلادیمێر سیمۆنەڤیچ ڤیسۆتسکی | وەرگێڕان | | و: لە ڕووسییەوە: گوڵاڵە نوری | ٢٠١١ |
| ١٣٩ | پەنجەرە بچووکەکان | چیرۆک | ئازاد عەبدولواحید | | ٢٠١١ |
| ١٤٠ | چەند بوارێکی زانستی زمانەوانی کوردی | زمانەوانی | حمید خالید کەریم | | ٢٠١١ |
| ١٤١ | گەڕانەوە | چیرۆک | چنوور نامیق | | ٢٠١١ |
| ١٤٢ | لە مەدرەسەی نالییدا | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | حەمە مەنتك | | ٢٠١١ |
| ١٤٣ | توخمەکانی بێ دەنگی | کۆمەڵە چیرۆک | | و: ستار شێخانی | ٢٠١١ |
| ١٤٤ | ئەو هەتیوەی نابێت بە پیاو | چیرۆک | عەزیز نەسین | و: عەبدولستار جەباری | ٢٠١١ |
| ١٤٥ | چۆن و چی بۆ منداڵ | لێکۆڵینەوە | لەتیف هەڵمەت | | ٢٠١١ |
| ١٤٦ | چۆن و چی بۆ منداڵ | لێکۆڵینەوە | لەتیف هەڵمەت | | ٢٠١١ |
| ١٤٧ | مصطبة وحيدة أمام القلعة | دراسة | فاروق مصطفى | | ٢٠١١ |
| ١٤٨ | في الشعر الكُردي المعاصر | دراسة | هشام القيسي | | ٢٠١١ |
| ١٤٩ | کتێبی بۆشاییەکان | شیعر | ئەدیب نادر | | ٢٠١١ |
| ١٥٠ | ئەو هەتیوەی نابێت بە پیاو | چیرۆک | | و:عەبدولستار جەباری | ٢٠١١ |

